# گرنگەکانی ئینتەرنێت



## نوێترین کتێب لەسەر بوارەکانی ئینتەرنێت

## 2009

بەکارهێنانی دروستکردنی جیمەیل

دروست کردنی سایتێکی تایبەتی جیهانی...

چۆنیەتی دروست کردنی سایت بەخۆڕایی...

کاتێک بۆ یەکەمجار ئینتەرنێت بە کار دەهێنین

چۆن زۆرترین خزمەت لەسایتی یاهوو وەردەگرین

دروست کردنی ئیمەیل و چۆنیەتی کارپێکردنی

گەڕان لە ئینتەرنێتدا (search )...

بینینی نەخشەی جیهان بە جوانترین شێوە

سایتێک بۆ دابەزاندنی بەرنامە بە خۆڕایی...

چۆنیەتی دابەزاندنی بەرنامەی (yahoo messenger)

چۆنیەتی خەزنکردنی وێنە وپەرە لەناو ئینتەرنێتدا

پێداویستیەکانی جیهانی مۆبایل لە ئینتەرنێتدا...

سایتێکی زۆر گرنگ بۆ دابەزاندنی پێداویستەکانی مۆبایل

بەکارهێنانی تازەترین سیستەم لەئەنتەرنێتدا...

زانینی پێشبینی کردنی کەش و هەوا...

رزگاربوون لە گشت جۆرە ڤایرۆسێک لە رێگەی سکانی ئۆن لاین Online Sean

چۆنیەتی پەیداکردن و دۆزینەوەی هەر بەرنامەو یارییەک بۆ مۆبایلەکەت

ناردن و وەرگرتنی وێنەو فایل و میوزیک .لە رێگەی Email ەوە...



سیدییەکی تایبەت
بە ئینتەرنێت وەربگرە

ئەم کتێبە بایەخی داوە بە لایەنە گرنگەکانی ئینتەرنێت
ئەو لایەنانەی کە رۆژانە دێنە بەردەستمان و کارمان پێیان دەبێت

ئامادەکردنی

ئیکرام هادی    محەمەد مەهدی

Aram

پرۆژەچاپکراوەکانی نێوەندی ئارام لەبواری تەکنیک زنجیرە ٢٤

# گرنگەکانی ئەنتەرنێت

## هەنگاوبەهەنگاوبۆهەمووئاستەکان

**2010**

بکرام هادی

عیماد مەهدی

محەمەد مەهدی

پرۆژەی (١٠٠) کتێبی بواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت

زنجیرەی (٢٤)

سەرپەرشتیاری پرۆژەکە: ئارامی مەلا محەمەد

لە نێوەندی ئارامەوە بڵاودەکرێتەوە

لەگەڵ ئەم کتێبەدا سیدییەک بەدیاری وەربگرە

ناوی کتێب : ویندۆزی ڤیستا

نووسین و ئامادەکردنی: إکرام هادی.محەمەد مەهدی.عیماد مەهدی

شوێنی چاپ : سلێمانی ٢٠٠٩-٢٠١٠

نۆبەتی چاپ : چاپی یەکەم

شوینی بلاوکردنەوە : نێوەندی ئارام

نرخی کتێب : تەنها شەش هەزار دینارە

بۆ دەست کەوتنی ئەمپەرتوکە پەیوەندی بکەبە نێوەندی ئارامەوە

ئاسیا ١٩١٨٥٦٥ سانا ١٢٤١٥١٨

کاری کۆمپیوتەر : نێوەندی ئارام

# بەکارهێنانی دروستکردنی ئیمەیڵ

## پێشەکییەک دەربارەی Gmail

Gmail (جیمەیڵ) کە کورتکراوەی Google Mail ە، خزمەتگوزارییەکی ئیمەیڵە لەلایەن Google ەوە. ئەم خزمەتگوزارییە لە ١ ی نیسانی ٢٠٠٤ دا کەوتە کار و بەشداربوون تێیدا تەنها بە بانگهێشتکردن بوو. لە ٢ ی شوباتی ٢٠٠٧ دا خزمەتگوزارییەکە کرا بە خزمەتگوزارییەکی کراوە بۆ هەموان.

گرنگترین لایەنی Gmail بریتییە لە پارێزراوی لە ئیمەیڵی نەخوازراو (ئەگەر پێشتر ئیمەیڵی Yahoo ت بەکارهێنابێت، لەوانەیە بزانیت کە دوای چەند هەفتەیەک لە دروستکردنی ئیمەیڵەکەت، ئیمەیڵەکەت پڕ دەبێتەوە لە نامەی نەخوازراو، کە لەکەسانی نەناسراوەوە پێت دەگەن و زۆربەیان ڕیکلامن). بە ئیمەیڵی نەخوازراو دەوترێت سپام (Spam). خزمەتگوزاری Gmail زۆر بەتوانایە لە لەناوبردنی سپامدا، بەشێوەیەک کە لەدوای بەکارهێنانی بۆ ساڵێک دەکرێت یەک ئیمەیڵی سپامت پێ نەگات.

لە سەرەتادا Gmail بڕی ١٠٢٤ مێگابایتی دەبەخشی بە بەکارهێنەرانی بۆ خەزنکردنی نامە و فایلەکانیان لە ئیمەیڵەکەیاندا، لەکاتێکدا کە خزمەتگوزارییەکانی دیکەی وەک Yahoo Mail تەنها ٣ مێگابایتیان دەبەخشی.

Gmail ئێستا (ئاباری ٢٠٠٨) ٦٧٠٠ مێگابایت دەبەخشێت بە بەکارهێنەران، هەموو سێ ڕۆژێکیش یەک مێگابایتی دەچێتە سەر.

Gmail ڕۆژ بە ڕۆژ بەکارهێنەری زیاد دەبێت بەهۆی خێرایییەوە، لەگەڵ ئاسانی بەکارهێنانی و بێ کێشەیی. لە ئێستادا دەیان ملیۆن بەکارهێنەری هەیە.

یەکێک لە هۆکارەکانی خوازراوی Gmail بریتییە لە توانای چات کردن لەگەڵ بەکارهێنەرانی تردا ڕاستەوخۆ لەناو ویندۆی ئیمەیڵەکەوە، بەهۆی خزمەتگوزاری Gtalk ی Google ەوە.

## بەشی یەکەم: باشترین شێوازی سایت بەکارهێنان

# دروستکردنی حسابێک

١. ئێمە فایەرفۆکسی ٣ بەکاردەهێنین بۆ ئیشکردن بە ئینتەرنێت و Gmail بەتایبەتی، چونکە خێرایی Gmail لە فایەرفۆکسدا زۆر زیاترە وەك لە خێرایی لە Internet Explorer دا. بۆ دەستکەوتنی فایەرفۆکس تەماشای سایتی firefox.com بکە. بە دڵنیاییەوە تۆ ئەتوانیت بەرنامەی تر بەکاربێنیت، وەك Internet Explorer یان Opera، بەلاّم ئەوە بزانە کە لە فایەرفۆکسدا خێراترین Gmail ت دەبێت.




٢. ئێمە وای دادەنێین کە تۆ پێشتر کەمێك ئیشت لە ئینتەرنێتدا کردبێت و بزانیت چۆن سایت بکەیتەوە.



# دروستکردنی حساپێکی Gmail

١- سەرەتا لە ئادرێسباری فایەرفۆکسدا ناونیشانی gmail.com لێبدە. (تێبینی ئەتوانیت هەر بنووسیت g وپەنجە بە کلیلی ئینتەردا بنێیت، فایەرفۆکس ڕاستەوخۆ Gmail ت بۆ دەکاتەوە).




٢- سایتی Gmail ت بۆ دەکرێتەوە. کلیك لەسەر Sign up for Gmail بکە.



٣- لاپەڕەیەکی نوێت بۆ دەکرێتەوە. لێرەدا ناوی خۆت بنووسە.




١. لێرەدا ناوی باوکت، یان ناوی بنەماڵەکەت بنووسە.




٢. لێرەدا ناونیشانی ئیمەیڵەکەت بنووسە. بۆ نموونە ئێمە دەمانەوێت ناونیشانمان ikramhadi@gmail.com بێت، بۆیە دەنووسین ikramhadi



٣. کلیك لەسەر دوگمەی check availability بکە بۆ ئەوەی بۆت دەربکەوێت ئایا کەسی تر ئەم ناونیشانی ئیمەیڵەی تۆی هەڵبژاردووە؟ ئیمەیڵ وەك ژمارەی تەلەفۆن وایە، ناکرێت دوو کەس یەك ناونیشانیان هەبێت.




٧- دوای کلیك کردن لەسەر دوگمەکەی سەرەوە، بە نووسینی سوور پێمان ووتراوە کە ئەو ناونیشانە کەسێکی تر خاوەنیەتی، بۆیە دەبێت ناونیشانێکی تر تاقی بکەینەوە. لە خوارەوەشدا چەند ناونیشانێکمان پیشان دەدرێت کە کەس خاوەنیان نییە و ئێمە ئەتوانین هەڵیان بژێرین.




٨- ئەم جارەیان ناونیشانی ikramhd مان تاقی کردووە، دەبینین کە لە خوارەوە پێمان دەوترێت (بە ڕەنگی شین) کە ئەتوانین ئەم ناونیشانە بەکاربێنین.




٤. لێرەدا پاسووۆرد (ووشەی نهێنی) خۆت بنووسە. ئەم ووشە نهێنییە بەکاردەهێنیت بۆ کردنەوەی ئیمەیڵەکەت لە داهاتوودا. پێویستە ووشەکە لە ٨ پیت کەمتر نەبێت. پێویستە ئەوەش بزانیت کە پیتی کەپیتاڵ و سموڵی ئینگلیزی جیاوازییان هەیە لە ووشەی نهێنیدا، بۆ نموونە ئەگەر ووشە نهێنییەکەت Arambbq ە، ئەوا ناتوانیت بۆ کردنەوەی ئیمەیڵەکەت arambbq بنووسیت، پێویستە پیتی یەکەم پیتی A ی کەپیتاڵی ئینگلیزی بێت. ئەگەر ئەتەوێت ووشە نهێنییەکەت زۆر بەهێز بێت ئەتوانیت پیتی کەپیتاڵ و سموڵ تێکەڵ بکەیت، بۆ نموونە ArAmBbQ. بەڵام پێویست ناکات شتێك زۆر قورس بۆ خۆت دیاری بکەیت، هەر ئەوەندە بەسە کە لە ٨ پیت کەمتر نەبێت و خەڵکی تر بەئاسانی نەتوانن "هەڵی بێنن".



١٠-لێرەدا دووبارە هەمان ووشەی نهێنی هەنگاوی (٩) بنووسەرەوە.




١١- ئیشارەت لەم بۆکسە بدە ئەگەر ئەتەوێت پاسووۆردەکەت لەسەر ئەم کۆمپیوتەرە خەزن بکرێت، ئەگەر کۆمپیوتەری خۆتە شتێکی باشە، چونکە لە داهاتوودا پێویست ناکات دووبارە پاسووۆردەکەت داخڵ بکەیت. بەڵام ئەگەر کۆمپیوتەرێکە لە شوێنێکی گشتیدا ئەوا خەزنکردنی پاسووۆردەکەت ڕێگە بە بەکارهێنەرانی دوای خۆت دەدات کە ئیمەیڵەکەت بکەنەوە. بۆیە ئەگەر کۆمپیوتەری خۆت نییە یان شوێنێکی گشتییە، ئیشارەتی ئەم بۆکسە لاببە.




١٢- ئەم بۆکسە تایبەتە بە Web History، کە خزمەتگوزارییەکی Google ە، کە ناونیشانی هەموو ئەو سایتانەی کە دەیکەیتەوە خەزن دەکات بۆ ئەوەی دواتر بتوانیت بگەڕێیتەوە سەریان. تەنها تۆ توانای ئەوەت دەبێت کە تەماشای ناونیشانی سایتەکان بکەیتە، واتە زانیارییەکانت ناکەونە دەست خەڵکی تر. ئەگەر ناتەوێت ئەم خزمەتگوزارییە بەکاربێنیت ئیشارەتی ئەم بۆکسە لاببە.




١٣-لێرەدا پرسیارێکی نهێنی هەڵبژێرە، بۆ نموونە ناوی یەکەم مامۆستات. لە داهاتوودا ئەگەر پاسووۆردەکەت لەبیرکرد ئەتوانیت دەستت بکەوێتەوە بەهۆی نووسینی وەڵامەکەت بۆ ئەم پرسیارە ئەتوانیت دەستت بکەوێتەوە.



١٤-لێرەدا وەڵامی پرسیارەکە بنووسە. پێویستە ئەم وەڵامە نهێنی بێت و کەسی تر نەیزانێت.

**Security Question:** What was your first teacher's name

If you forget your password we will ask for the answer to your security question. Learn More

**Answer:** Taqqyoddin (14)

**Secondary email:**

This address is used to authenticate your account should you ever encounter problems or forget your password. If you do not have another email address, you may leave this field blank. Learn More

١٥-لێرەدا ئەتوانیت ناونیشانی ئیمەیڵێکی ترت بنووسیت ئەگەر هەتە، لەداهاتوودا ئەگەر پاسووۆردەکەت لەبیرکرد ئەتوانیت داوابکەیت لەرێگەی ئیمەیڵەکەی ترتەوە پاسووۆردەکەت دەستبکەوێتەوە. ئەشتوانیت بە بەتاڵی بەجێی بێڵیت.

**Answer:** Taqqyoddin

**Secondary email:** ikramkurdi@gmail.com (15)

This address is used to authenticate your account should you ever encounter problems or forget your password. If you do not have another email address, you may leave this field blank. Learn More

١٦-لێرەدا وڵاتەکەت هەڵبژێرە. ئێمە عێراقمان هەڵبژاردووە.

**Secondary email:** ikramkurdi@gmail.com

This address is used to authenticate your account should you ever encounter problems or forget your password. If you do not have another email address, you may leave this field blank. Learn More

**Location:** Iraq (العراق) (16)

**Word Verification:**

**Terms of Service:**

India
Indonesia
Iran (ایران)
Iraq (العراق)
Ireland
Isle of Man
Israel (ישראל)
Italy (Italia)
Jamaica
Japan (日本)
Jersey
Jordan (الاردن)
Kazakhstan (Казақстан)
Kenya
Kiribati
Kuwait (الكويت)
Kyrgyzstan (Кыргызстан)
Laos (ລາວ)
Latvia (Latvija)
Lebanon (لبنان)

ed above
s of
Version

١٧- تەماشای ئەم پیتە نووسراوانەی سەرەوە بکە و لە بۆکسەکەی خوارەوەدا بیان نووسە. لێرەدا کەپیتاڵ و سمۆڵ جیاوازی نییە.




١٨- لە کۆتاییدا کلیك لەسەر I accept. Create my account بکە.




١٩- لەجیاتی ئەوەی ئیمەیڵەکەمان بۆ دروست بکرێت، لاپەڕەکەی پێشوومان پیشان درایەوە. ئەمەش مانای ئەوەیە هەڵەیەکمان کردووە. سەرەتا پێویستە دووبارە پاسوۆردەکەمان بنووسینەوە لەم دوو بۆکسەدا. هەر هەڵەیەکمان کردبێت بە ڕەنگی سوور پیشان دەدرێت.



٢٠-کێشەکەی ئێمە لەوەدا بوو کە پیتەکانی ناو وێنەکەمان بەهەڵە نووسیبوو، بۆیە لێرەدا وێنەیەکی نوێمان پیشان دراوە بۆ ئەوەی بینووسینەوە.

**Location:** Iraq (العراق)

**Word Verification:** Type the characters you see in the picture below.




beizin

Enter the letters as they are shown in the image above.
Letters are not case-sensitive

**Terms of Service:** Please check the Google Account information you've entered above (feel free to change anything you like), and review the Terms of Service below.

٢١- ئەگەر ئەم بۆکسە پیشان درابوو ئیشارەتی لێ بدە.

Printable Version

```
Google Terms of Service

Welcome to Google!

1. Your relationship with Google
```

By clicking on 'I accept' below you are agreeing to the Terms of Service above and both the Program Policy and the Privacy Policy.

21 ☑ Ai sensi dell'art. 1341 del codice civile, l'utente approva separatamente gli articoli 1 (Descrizione del Servizio), 3 (Utilizzo consentito), 4 (Contenuti del Servizio), 5 (Diritti di proprietà intellettuale), 9 (Inattività dell'account), 11 (Risoluzione del Contratto), 13 (Legge applicabile; foro competente) delle presenti condizioni.

Confermi prego.

I accept. Create my account.

٢٢-کلیك لەسەر I accept. Create my account بکە.




٢٣-ئەم جارەیان پرۆسەکە سەرکەوتوو بوو، ئەم لاپەڕەیەمان پیشان دەدرێت. کلیك لەسەر I'm ready - show me my account بکە. ئێستا ئیمەیلەکەت دروستکراوە و ئامادەیە بۆ بەکارهێنان.



بەشی دووەم:

# بەکـــــارهێنانی

## داخلبوون بۆ ناو Gmail

١. سەرەتا لە ئادرێسبارِدا بنووسە g. بەڵام ئەگەر فایەرفۆکس بەکارناهێنیت ئەوا لە ئادرێسبارِدا بنووسە gmail.com.




٢. کلیك لەسەر دوگمەی Go بکە.




٣. لاپەڕەی سەرەتای Gmail ت بۆ دەکرێتەوە، لێرەدا ناونیشانی ئیمەیڵەکەت بنووسە. پێویستە ناونیشانە تەواوەکە بنووسیت، واتە دەبێت @gmail.com ی تێدابێت، وەك لە وێنەکەدا دیارە.




YAHOO!

٤. لێرەدا پاسووۆردەکەت بنووسە.




٥. ئیشارەت لەم بۆکسە بدە ئەگەر ئەتەوێت کۆمپیوتەرەکە پاسووۆردەکەتی لەبیر بمێنێت.




٦. کلیك لەسەر Sign in بکە بۆ داخڵ بوون.




٧. چاوەڕێ بکە تا ئەم دیارخەرە پڕ دەبێتەوە.



٨. ویندۆی Gmail ت بۆ دەکرێتەوە.




# سندوقی نامەی هاتوو (ئینبۆکس) Inbox و وەڵام دانەوەی نامە

سەرەکی ترین شوێنی ئیمەیڵ بریتییە لە سندوقی نامەی هاتوو، کە پێی دەوترێت ئینبۆکس و هەر نامەیەکی نوێ بۆ تۆ بێت دەچێتە ئەم شوێنەوە.

١. لە هەر شوێنێکی ئیمەیڵەکەتدا بوویت، بۆ ڕۆشتن بۆ ئینبۆکس کلیك لەسەر Inbox بکە.



٢. ژمارەکەی تەنیشت ئینبۆکس پێت دەڵێت کە چەند نامەی نەخوێنراوەت هەیە، بەگشتی واتە چەند نامەی نوێت بۆ هاتووە.




٣. نامە نەخوێنراوەکان بە ڕەنگی تۆخ پیشان دەدرێن. لێرەدا ناوی نێرەری نامەکەت پیشان دەدرێت.

٤. لێرەدا بابەتی نامەکە.



٥. لێرەدا بەرواری بەدەست گەیشتنی نامەکەت پیشان دەدرێت. ئەگەر نامەکەت ئەمڕۆ بەدەست گەیشتبێت ئەوا ئەو کاتژمێرەت پیشان دەدرێت کە نامەکەت بەدەست گەیشتووە.




٦. بۆ کردنەوەی نامەیەك، کلیك لەسەر نامەکە بکە، گرنگ نییە لە چ شوێنێکی نامەکەدا کلیك ئەکەیت، وەك نێرەر یان بابەت یان کات.




٧. نامەکەت بۆ دەکرێتەوە.



٨. بۆ وەڵامدانەوەی نامەکە کلیك لەسەر Reply بکە.




٩. ڕاستەوخۆ بۆکسی نووسینت بۆ دەکرێتەوە لە خوارەوەی نامەکەدا بۆ نووسینی وەڵامەکەت.




١٠. جیمەیڵ بەشێوەیەکی ئەوتۆماتیکی هەموو خولەکێك نامەکەت خەزن دەکات بۆ ئەوەی بتپارێزێت لە فەوتانی نامەکە ئەگەر کێشەیەك ڕوویدا، بۆ نموونە ئەگەر کارەبا کوژایەوە یان پەیوەندی ئینتەرنێتەکەت بۆ ماوەیەك لەکار بکەوێت. هەرکاتێك ئەم دوگمەیە ڕەنگی سپی بوو ئەوا مانای ئەوەیە نامەکەت خەزن کراوە و ئەتوانیت کلیك لەسەر شوێنێکی تر بکەیت یاخود جیمەیڵ دابخەیتەوە بەبێ خەمی فەوتانی نامەکەت.



١١. ئێمە نامەکە نانێرین، بەڵکو دەگەڕێینەوە بۆ سەرەوە و کلیك لەسەر Inbox دەکەین.




١٢. نامە خەزنکراوەکان دەچنە شوێنێکەوە پێی دەوترێت Drafts، واتە مسۆدەکان، یاخود ڕەشنووس بەکوردی. بۆ گەڕانەوە بۆسەر نامەکەی پێشوو، کلیك لەسەر Drafts دەکەین. لەگەڵ ئەمەشدا لەتەنیشت نامەکەدا کە وەڵامان دەدایەوە بە ڕەنگی سوور نووسراوە Drafts، لەم حاڵەتەدا ئەتوانیت کلیك لەسەر نامەکەش بکەیت بۆ گەڕانەوە بۆسەر ئەو نامەیەی کە ئەمان نووسی.



١٣. لە بەشی Drafts دا کە بۆمان دەکرێتەوە کلیك لەسەر نامەکەمان دەکەین.




١٤. دووبارە نامەکەمان بۆ دەکرێتەوە. بەشی نووسینی نامەکە لەخوارەوەی نامەکەدایە، بۆیە دەبێت بچین بۆ خوارەوەی لاپەڕەکە.



١٥. لێرەدا ئەتوانین گۆڕانکاری زیاتر لە نامەکەماندا بکەین. بۆ ناردنی نامەکە کلیک لەسەر Send دەکەین.




١٦. لێرەدا بە ڕەنگی زەرد پێمان دەوترێت کە نامەکەمان نێرراوە، لە خوار نامە ئەسڵییەکەشەوە نامەکەی ئێمە پیشان دەدرێت.



## رێکخستنی سندوقی نامەکان

١. لەبەر گەورەیی شوێنی خەزنکردنی فایلەکانت لە جیمەیلدا، تۆ بە دەگمەن پێویستت بەوە دەبێت ئیمەیل بسڕیتەوە. لەجیاتی سڕینەوەی ئیمەیل، شتێکمان هەیە پێی دەڵێن ئەرشیف کردن. کاتێك نامەیەکت خوێندەوە و ویستت لە سندوقی نامەکانتدا لای ببەیت، ئەتوانیت ئەرشیفی بکەیت، لەم کاتەدا نامەکە دەچێتە ئەرشیفەوە و تۆ ئیتر بەرچاوت ناکەوێت لە سندووقەکەدا. سەرەتا نامەیەك یان چەند نامەیەك هەڵبژێرە بۆ ئەرشیف کردن، هەڵبژاردن بە کلیك کردن لەسەر ئەم بۆکسانەی تەنیشت نامەکان دەکرێت.




٢. دوای هەڵبژاردنی نامەکان، کلیك لەسەر Archive بکە.



٣. نامە ئەرشیف کراوەکان دەچنە شوێنێکەوە پێی دەوترێت All Mail. بۆ کردنەوەی All Mail کلیك لەسەر All Mail بکە لەخوارەوەی ئینبۆکسدا.




٤. ئەتوانیت ئەستێرە بۆ هەندێك نامەی گرنگ دابنێیت بۆ ئەوەی لە داهاتوودا بە ئاسانی بتوانیت بیاندۆزیتەوە. بۆ دانانی ئەستێرە، کلیك لەسەر ئایکۆنی ئەستێرە بکە لەتەنیشت نێرەری نامەکەوە.




٥. بۆ پیشاندانی نامە ئەستێرەلێدراوەکان، کلیك لەسەر Starred بکە.



٦. لێرەدا نامە ئەستێرەلێدراوەکانمان پیشان دەدرێت. بۆ لابردنی ئەستێرەی نامەیەك، کلیك لەسەر ئەستێرەکە بکە.




# نووسینی نامـــــــــــــه

١. کلیك لەسەر Compose Mail بکە.



٢. لێرەدا ئیمەیڵی ئەو کەسە بنووسە کە ئەتەوێت نامەکەی بۆ بنێریت. ئەگەر کەسەکە پێشتر نامەت بۆ ناردبێت، ئەوا هەر بە نووسینی پیتی یەکەم و دووەمی ئیمەیڵەکە، جیمەیڵ ناونیشانی تەواوی کەسەکەت پیشان ئەدات، بۆ بەکارهێنانی ئەو ناونیشانەی کە جیمەیڵ پیشانت ئەدات، ئەتوانیت کلیك لەسەر ناونیشانەکە بکەیت، یاخود پەنجە بە کلیلی Tab یان Enter دا بنێیت. لە وێنەکەی خوارەوەدا دوو ناونیشانمان پیشان دراوە، بۆ بەکارهێنانی ناونیشانەکەی خوارەوەیان، ئەتوانیت پەنجە بە کلیلی سەهمی خوارەوەی سەر کیبۆردەکەدا بنێین، پاشان Enter بکەین.




٣. دوای نووسینی ئیمەیڵی یەکەم، ئەگەر ئەتەوێت کەسێکی دیکە زیاد بکەیت بۆ ئەوەی ئیمەیڵەکەی پێ بگات، ئەتوانیت کۆمایەك (فاریزەی ئینگلیزی) دابنێیت و ئیمەیڵی دووەم بنووسیت.



٤. لێرەدا بابەتی نامەکەت بنووسە. بۆ نموونە ئەگەر نامەکەت پرسیارێکە لە کەسێکی ئەکەیت، ئەتوانیت بنووسیت Pirsyar. هتد.




٥. بۆ ناردنی فایلێك (ئەتاچمێنت)، کلیك لەسەر Attach a file بکە.




YAHOO!

٦. بۆ دیاریکردنی ئەو فایلەی کە ئەتەوێت بینێریت، کلیك لەسەر Browse بکە. لە فایەرفۆکسی ٣ دا ئەتوانیت هەر کلیك لەسەر بۆشاییەکە بکەیت لەجیاتی دوگمەکە.




٧. دایەلۆگ بۆکسی File Upload ت بۆ دەکرێتەوە، لێرەدا فایلەکەت هەڵبژێرە بە کلیك کردن لەسەری.



٨. کلیك لەسەر Open بکە.




٩. بۆ زیادکردنی فایلێکی تر، کلیك لەسەر Attach another file بکە.



١٠. بۆ لابردنی فایلێك کە کەمێك پێشتر زیادد کردبێت، کلیك لەسەر remove بکە.




١١. بۆ لابردنی فایلێك کە ماوەیەکی زۆر پێش ئێستا زیادد کردبێت، ئیشارەتی تەنیشت ناوی فایلەکە لابە.
(دوای ئەوەی فایلێك زیاد دەکەیت، جیمەیڵ دوای ماوەیەکی کەم دەست دەکات بە خەزنکردنی فایلەکان، بۆیە لە لاکێشەکەدا لادەچن و دەچنە سەرەوە، کە پێت دەڵێت ئەم فایلانە خەزن بوون و ئەگەر جیمەیڵیش دابخەیتەوە ئەوا فایلەکان هەر لەناو ئیمەیڵەکەدا دەمێنن).



١٢. لێرەدا نامەکەت بنووسە.




١٣. بۆ ناردنی نامەکەت، کلیک لەسەر Send بکە.




١٤- لە کۆتاییدا دەگەڕێیتەوە بۆ ئینبۆکس و لێرەدا پێت دەوترێت کە نامەکەت نێرراوە.



# دروست کردنی سایتێکی تایبەتی جیهانی

## بەکارهێنانی Blogger بۆ دروستکردنی سایت لە شێوەی بلۆگ

### سەرەتایەك دەربارەی بلۆگ

ووشەی بلۆگ (blog) کورتکراوەی ووشەی وێب لۆگ (web log) ە، بریتییە لە سایتێك، کە بەگشتی لەلایەن یەك کەس یان چەند کەسێکەوە بەڕێوەدەبرێت، تیایدا بابەتی هەمەجۆر بڵاو دەکرێتەوە، لە ڕوونکردنەوە و باسی ڕووداو یان باسی ژیانی ڕۆژانەی نووسەری بلۆگەکە. بۆ نموونە بلۆگی تایبەت بە هەواڵ هەواڵی تێدا بڵاو دەکرێتەوە، لە شێوەی نووسین و وێنە و ڤیدیۆ. بە هەر بابەتێکی بڵاوکراوە دەوترێت پۆست (post). ئەم پۆستانە لە سایتەکەدا لە نوێوە بۆ کۆن ڕیز دەکرێن.




لە سەرەوەدا وێنەی بلۆگێکمان پیشان داوە. لە سەرەوەی لای چەپدا ناوی بلۆگەکە بە گەورەیی نووسراوە (Ikram Kurdi's Blog)، لە خوارەوەدا بەروارێکمان هەیە لەگەڵ ناونیشانی پۆستێك (...Quotes). لەلای ڕاستدا سەرەتا لیستێکمان هەیە لە هەموو پۆستەکانی ناو بلۆگەکە، کە بەپێی ساڵ و مانگ جیاکراونەتەوە. لەخوارتردا وێنەی نووسەری بلۆگەکەمان هەیە، لەگەڵ لینکێك کە ئەگەر کلیکی لەسەر بکرێت ئەوا زانیاری زیاترمان دەربارەی نووسەرەکە پێ دەڵێت.

# داخڵ بوون بۆناو Blogger

ســایتی بلوگمــان زۆرە، وەك Blogger.com (بلوگــەر، کــە گوگــڵ خاوەنیــەتی)، Wordpress، Life Journal، TypePad و هتد. لێرەدا ئێمە باسی Blogger دەکەین، چونکە بەکارهێنانی خێرا و ئاسانە.

١. پێش هەموو شتێك، بۆ ئەوەی Blogger بەکاربێنیت پێویستت بە حسابێکیGoogle یان Gmail (هەردووکیان یەك شتن) هەیە، ئەگەر حسابێکی Gmail ت نییە، ئەوا دروستی بکە، ئێمە بابەتمان تایبەت بە Gmail نووسیوە و ئەتوانیت بیخوێنیتەوە بۆ زانینی چۆنێتی دروستکردنی حسابێکی Gmail.

٢. سایتی blogger.com بکەرەوە.



٣. ئێمە باسی نوسخەی ئینگلیزی سایتی Blogger دەکەین، بۆیە ئەگەر نوسخەی زمانێکی دیکەت پیشان درا و ویستت بیکەیت بە ئینگلیزی، سەرەتا کلیك لێرە بکە.



٤. لە لیستەکەدا English هەڵبژێرە.




٥. کەمێك چاوەڕێ بکە تا لاپەڕەکە دەبێت بە ئینگلیزی. لێرەدا ناونیشانی Gmail ت بنووسە، بۆ نموونە .ikramkurdi@gmail.com



٦. لێرەدا ووشەی نهێنیت بنووسە.




٧. ئەگەر ئەتەوێت ناونیشانی ئیمەیڵ و ووشەی نهێنیت لەسەر ئەم کۆمپیوتەرە خەزن بکرێت کە بەکاری دەهێنیت، ئیشارەت لەم بۆکسە بدە. بەڵام ئەگەر ناتەوێت خەزن بکرێت، ئیشارەتی لێ مەدە. ئەگەر کۆمپیوتەری خۆتە، ئەتوانیت ئیشارەتی لێ بدەیت بۆ ئەوەی لە داهاتوودا ڕاستەوخۆ داخڵ ببیت بەبێ پڕکردنەوەی ئەم خانانە. بەڵام ئەگەر کۆمپیوتەری شوێنێکی گشتییە یان کۆمپیوتەری کەسێکی دیکەیە وا چاکە ئیشارەتی لێ نەدەیت چونکە ئەگەر بەجێی بێڵیت ئەوا کەسی دوای خۆت ئەتوانێت بچێتە ناو حسابەکەتەوە.



٨. کلیك لەسەر SIGN IN بکە.




٩. لاپەڕەی سەرەتای حسابەکەت بۆ دەکرێتەوە. بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەگەر تۆ یەکەمجارتە Blogger بەکاردەهێنیت ئەوا لاپەڕەکەت بەتاڵتر دەبێت لەوەی خوارەوە.



# دروستکردنی بلۆگ

١. بۆ دروستکردنی بلۆگێکی نوێ، کلیك لەسەر Create a Blog بکە.




٢. لێرەدا تایتڵی بلۆگەکەت بنووسە کە بابەتی بلۆگەکەت ڕوون دەکاتەوە. بۆ نموونە ئێمە دەنووسین Teknologya، واتە تێکنۆلۆجیا.



٣. لێرەدا ناونیشانی ئینتەرنێتی بلۆگەکەت بنووسە، ئێمە هەر تایتڵی بلۆگەکە بەکاردەهێنین کە teknologya یە. لە داهاتوودا بۆ کردنەوەی بلۆگەکە ناونیشانی www.teknologya.blogspot.com بەکاردەهێنین. ئەو ناونیشانەی دەینووسیت پاشگری blogspot.com ی بۆ زیاد دەکرێت.




٤. لێرەدا ئەو پیتانە بنووسە کە لە وێنەکەی سەرەوەدا پیشان دراون.



٥. کلیك لەسەر Continue بکە.




٦. ئەگەر کێشەیەك هەبێت لە شێوازی پڕکردنەوەی فۆرمەکەدا، بۆ نموونە ئەگەر تۆ ناونیشانێکت هەڵبژاردبێت کە پێش تۆ کەسێکی تر بردبێتی، ئەوا دووبارە لاپەڕەکەت پیشان دەدرێتەوە و دەبێت ناونیشانەکە بگۆڕێت، هەروەها ئەگەر پیتەکانی ناو وێنەکەت بە هەڵە داخڵ کردبێت، ئەوا دەبێت دووبارە پیتەکان داخڵ بکەیتەوە. هەر هەڵەیەکت کردبێت ئەوا بە ئیشارەتێکی سەرسوڕمان لە سێگۆشەیەکدا بۆت دیاری دەکرێت.

بەڵام ئەگەر کێشەی تێدا نەبێت، ئەوا لاپەڕەیەکی نوێت پیشان دەدرێت کە تیایدا دیمەنێك بۆ بلۆگەکەت هەڵدەبژێریت. دواتر ئەتوانیت بە ئاسانی ئەم دیمەنە بگۆڕیت، بۆیە سەرتی پێوە مەنێشێنە و دانەیەك هەڵبژێرە بە کلیك کردن لەسەری.



٧. دوای هەڵبژاردنی دیمەنەکە کلیك لەسەر Continue بکە.




٨. لاپەڕەیەکی نوێت پیشان دەدرێت. کلیك لەسەر START BLOGGING بکە.



٩. لاپەڕەیەکی نوێت بۆ دەکرێتەوە. لێرەدا ئەتوانیت یەکەم پۆست بنووسیت بۆ بلۆگەکەت. هەر بۆ تاقیکردنەوە لێرەدا بنووسە Test (واتە تاقیکردنەوە)، ئەمە دەبێت بە ناونیشانی (تایتڵ)ی پۆستەکەت.




١٠. لێرەشدا بۆ دەقی پۆستەکەت شتێك بنووسە.



١١. کلیك لەسەر PUBLISH POST بکە.




١٢. لاپەڕەیەکی نوێت پیشان دەدرێت. کلیك لەسەر View Blog بکە.






١٣. بلوگەکەت بۆ دەکرێتەوە.




# نووسینی پۆستی نوێ

١. ئێمە لە سەرەتاوە دەست پێ دەکەین. لە بەرنامەی ئینتەرنێتەکەدا بنووسە blogger.com و پەنجە بە کلیلی Enter دا بنێ.




٢. دەچیتە ناو حسابەکەتەوە (بە مەرجێك ووشە نهێنییەکەت خەزن کرابێت، ئەگەر خەزن نەکراوە لەسەر کۆمپیوتەرەکەت ئەوا دووبارە زانیارییەکانت داخڵ بکە بۆ کردنەوەی حسابەکەت).



٣. ئێمە چەند بلۆگێکمان هەیە، هەموویان لێرەدا پیشان دەدرێن. بلۆگی Teknologya کە پێشتر دروستمان کرد لە سەرەوەی لیستەکەدایە. ئێمە ئەمانەوێت پۆستێکی نوێ لەم بلۆگەدا بنووسین، بۆیە لەژێر ناوی بلۆگەکەدا کلیك لەسەر New Post دەکەین.




٤. وەك پێشتر باسمان کرد، لەم ناوچانەدا تایتڵ و دەقی پۆستەکەمان دەنووسین.



٥. بۆ نووسین بە کوردی لە ئینتەرنێتدا پێویستت بە فۆنتێکی Unicode هەیە وەک فۆنتی Unikurd، بۆ دەستکەوتنی ئەم فۆنتە سەردانی kurditgroup.org بکە. لە نووسینی کوردیدا پێویستە ئاڕاستەی نووسین لە چەپ بۆ ڕاستەوە بگۆڕین بۆ ڕاست بۆ چەپ، بۆ ئەم مەبەستە سەرەتا کلیک لەسەر Edit Html دەکەین.




٦. کلیک لەسەر شوێنێکی دەقەکە بکە، گرنگ نییە چ شوێنێك.



٧. ئێستا پەنجە بە کلیلی Home دا بنێ لەسەر کیبۆردەکەت بۆ ڕۆشتن بۆ سەرەتای دێڕەکە. پاشان نووسینەکەی خوارەوە بنووسە.

<p dir=”rtl” align=”right”>

ئەو فاریزانەی سەرەوە (کە پێیان دەوترێت کووتەیشن مارك) کە دەوری پیتەکانی rtl و ووشەی right یان داوە بە بەکارهێنانی کلیلەکانی ط+Shift دەنووسرێن.




٨. ئێستا کلیك لەسەر Compose بکە.



٩. ئێستا زۆر بە ئاسانی و بەبێ کێشە دەتوانیت بنووسیت، هەر وەك لە بەرنامەی وۆرددا.



١٠. کە گەیشتیتە کۆتایی دێڕێك، Enter مەکە، بەڵکو Shift و Enter بکە. چونکە ئەگەر Enter بکەیت ئەوا هەنگاوی (٧) بەتاڵ دەبێتەوە.

بۆ دانانی وێنە، کلیك لەسەر ئایکۆنی Add Image بکە.



١١. ویندۆیەکی نوێت بۆ دەکرێتەوە. کلیك لەسەر Browse بکە بۆ دیاریکردنی وێنەیەك لەسەر کۆمپیوتەرەکەت بۆ ئەوەی بیخەیتە ناو پۆستەکەتەوە.




١٢. ویندۆیەکی نوێت بۆ دەکرێتەوە. لێرەدا وێنەکەت بدۆزەرەوە و دەبڵ کلیکی لەسەر بکە. دوای ئەوەی دەبڵ کلیکت کرد ویندۆکە دادەخرێتەوە.



١٣. لەلای چەپدا None هەڵبژێرە. لە لای ڕاستدا Large هەڵبژێرە. هەروەها لەخوارەوەدا ئیشارەت لەم بۆکسە بدە.



١٤. کلیك لەسەر UPLOAD IMAGE بکە.




١٥. ماوەیەك چاوەڕێ بکە تا وێنەکەت خەزن دەکرێت.



١٦.دوای ئەوەی وێنەکەت خەزنکرا، لاپەڕەکەی خوارەوەت پیشان دەدرێت، کلیك لەسەر Done بکە.




١٧.دەگەڕێیتەوە سەر لاپەڕی پۆستەکەت. دەبینیت وێنەکە هاتووەتە ناو پۆستەکەوە. بۆ ئەوەی وێنەکە ببەیتە خوارە نووسینەکە، وێنەکە ڕابکێشە بۆ خوار نووسینەکە.




١٨.بۆ ئەوەی وێنەکە بخەیتە ناوەڕاستەوە، کلیك لەسەر وێنەکە بکە پاشان کلیك لێرە بکە.



١٩. بۆ نووسینی بابەت لەژێر وێنەکەدا، کلیك لەسەر وێنەکە بکە، پاشان پەنجە بە کلیلی End دا بنێ، پاشان پەنجە بە کلیلی Enter دا بنێ.

٢٠. بۆ گۆڕینی قەبارەی نووسین، نووسینەکە دیاری بکە، پاشان کلیك لێرە بکە.




٢١. لە لیستەکەدا کلیك لەسەر قەبارەیەك بکە.




٢٢. بۆ تێخستنی ڤیدیۆ، کلیك لەسەر ئایکۆنی Add Video بکە.



٢٣.کلیك لەسەر Browse بکە بۆ دۆزینەوەی ڤیدیۆکەت.




٢٤.ویندۆی File Upload دەکرێتەوە. لێرەدا فایلێکی ڤیدیۆ هەڵبژێرە و دەبڵ کلیکی لەسەر بکە. دەکرێت فایلەکەت AVI، MPEG، MOV، MP4 یان WMV بێت.



٢٥. ناونیشانێك بۆ ڤیدیۆکەت بنووسە.




٢٦. ئیشارەت لەم بۆکسە بدە.



٢٧.کلیك لەسەر UPLOAD VIDEO بکە.




٢٨.چاوەڕێ بکە تا ڤیدیۆکەت خەزن دەکرێت.



۲۹. دوای ئەوەی ڤیدیۆکەت خەزن بوو لێرەدا دەردەکەوێت. ئەتوانیت وەک وێنە مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت بۆ گۆڕین و ڕێکخستنی شوێنەکەی.



۳۰.بۆ دروستکردنی لینکێک (بەکوردی پێی دەوترێت بەستەر) لەنێوان نووسینێک و سایتێک یان لاپەڕەیەکی ئینتەرنێتی دیکەدا، سەرەتا نووسینەکە دیاری بکە، پاشان کلیک لێرە بکە.






٣١. دایەلۆگ بۆکسێکت بۆ دەکرێتەوە.
لێرەدا ناونیشانی لاپەڕەکە یان سایتەکە بنووسە.




٣٢. کلیك لەسەر OK بکە.

# بڵاوکردنەوەی پۆستەکەت

١. هەموو پێنج خولەکێك پۆستەکەت خەزن دەبێت (بەڵام بڵاوناکرێتەوە، تەنها خەزن دەکرێت)، ئەتوانیت پۆستەکەت خەزن بکەیت بۆ ئەوەی دواتر بڵاوی بکەیتەوە. بۆ نموونە کاتێك کە نیوەی پۆستەکەت نووسیوە بەڵام ئەتەوێت لە داهاتوودا نیوەکەی دیکەی بنووسیت. بۆ ئەم مەبەستە کاتێك تەواوبوویت لە دەستکاریکردنی پۆستەکەت، کلیك لەسەر Save بکە.



٢. ئێستا ئەتوانیت لاپەڕەکە دابخەیتەوە و ئەتوانیت کۆمپیوتەرکەت بکوژێنیتەوە. دواتر بۆ دووبارە کردنەوەی ئەم پۆستە خەزنکراوە، سەرەتا کلیك لەسەر Edit Posts بکە.




٣. پۆستەکانی ناو بلۆگەکەت لێرەدا پیشان دەدرێن. هەر پۆستێك ووشەی View و Edit ی لە پێشەوەدا هەبوو ئەوا واتە پۆستەکە بلاو کراوەتەوە لەسەر بلۆگەکە. بەڵام ئەگەر تەنها ووشەی Edit ی لەبەردەمدا بوو ئەوا واتە خەزن کراوە و بلاو نەکراوەتەوە. پۆستە خەزنکراوەکەی ئێمە لەسەرەوەی پۆستەکانی ترە، بۆ دووبارە کردنەوەی، کلیك لەسەر Edit دەکەین.




٤. دووبارە پۆستەکەمان بۆ دەکرێتەوە. ئەتوانیت بە خواستنی خۆمان گۆڕانکاری تێدا بکەین. پاشان بۆ بلاوکردنەوەی پۆستەکە کلیك لەسەر PUBLISH POST دەکەین.



٥. لاپەرەیەکی نوێت بۆ دەکرێتەوە، وەك پێشتر ووتمان بۆ تەماشاکردنی بلۆگەکەت کلیك لەسەر View Blog بکە.




٦. بلۆگەکەمان پیشان دەدرێت. بەڵام پۆستەکە نوێکەمان دیار نییە!




٧. هۆی ئەمە Blogger نییە، ئێمەش هیچ هەڵەیەکمان ئەنجام نەداوە. بەڵکو هۆکاری کێشەکە کۆمپانیای هێڵی ئینتەرنێتەکەتە. ئەم حاڵەتە لەگەڵ بەکارهێنەرانی گۆران نێت دا ڕوودەدات، ئێمە باسی هۆکارەکەی ناکەین چونکە دوور و درێژە، بەڵام بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، پەنجە لەسەر کلیلی Ctrl دابنێ، پاشان پەنجە بە کلیلی F5 دابنێ. لاپەڕەکەت دووبارە دەکرێتەوە و ئەمجارە بابەتە نوێکەتی تێدایە. ئەوەش بزانە کە Refresh (یان Reload) کردنی لاپەڕەکە هیچ سوودی نییە، بەڵکو دەبێت Ctrl و F5 بکەیت.



# سڕینەوەی پۆست

١. کاتێک سەرەتا Blogger دەکەیتەوە، کلیک لەسەر Posts بکە لەژێر ناوی بلۆگەکەتدا.




٢. لە بەرامبەر ئەو پۆستەی کە ئەتەوێت بیسڕیتەوە کلیک لەسەر Delete بکە.



٣. لاپەڕەیەکی نوێت بۆ دەکرێتەوە کە لێت دەپرسێت ئایا دڵنیایت کە ئەتەوێت پۆستەکە بسڕیتەوە؟ کلیك لەسەر Delete it بکە بۆ سڕینەوەی پۆستەکە.




# گۆڕینی دیمەنی بلۆگەکەت

١. لە سەرەتای بلۆگەردا، لەژێر ناوی بلۆگەکەتدا کلیك لەسەر Layout بکە.



٢. کلیك لەسەر Pick New Template بکە.




٣. لەم لیستەدا دیمەنێکی نوێ بدۆزەرەوە. بۆ تاقیکردنەوەی دیمەنەکە بەبێ ئەوەی بلۆگەکەت گۆڕانکاری بەسەردا بێت، لەژێر دیمەنەکەدا کلیك لەسەر Preview Template بکە. بۆ هەڵبژاردنی دیمەنێك، کلیك لەسەر دیمەنەکە بکە، پاشان کلیك لەسەر Save Template بکە.




Blogger زۆر فراوانترە لەوەی ئێمە باسمان کرد، بەڵام لێرەدا تەنها ئەوەندەمان توانی باس بکەین. هیوادارین سوودی بە تۆی خۆشەویست گەیاندبێت.

# چۆنیەتی دروست کردنی سایت

**ئەگەر ئێمە بمانەوێت سایتێك دروست بکەین بۆ خۆمان بە ئاسانی و بە خۆڕایی ئەوا پێویستە بە هۆی یارمەتی سایتێکی ترەوەو ئەم خزمەتگوزاریە بە کاربهێنین ،ئێستا لە سەرەتاوە بۆ دروست کردنی سایت ئەم کارانە دەکەین :**

**١- سەرەتا ئەم ناونیشانە لێدەدەین ( www.4t.com: )**




**پاش ئەوەی کە سایتەکەمان بۆ کرایەوە**

**ئێستا بۆ ئەوەی کە سایتەکەمان بە خۆڕایی دروست بکەین پێویستە کلیك لە ( free sub-domain ) بکەین و ناوی ئەو سایتە بنوسین کە دەمانەوێت دروستی بکەین یان دەتوانی ناوی سایتەکە بە ناوی خۆتەوەوبێت پاشان کلیك لە Next >> بکەین :**



پاش ئەوەی کە ناوی سایتەکەمان دیاری کرد و [Next >>] مان کرد کلیك لە (free) دەکەین و جارێکی تر (next) دەکەین:




پاشان لەم بەشەی خوارەوەدا کلیك لە No thanks, continue with my ad-supported account. > دەکەین:



دواتر لەم بەشەدا چی تێدایە پڕی دەکەینەوە وەکو ناوی خۆمان و ئیمەیلەکەمان و دانانی پاسسۆردی سایتەکەمان و هتد...




Free Web Space and Site Hosting -- Freeservers.com - Microsoft Internet Explorer
File Edit View Favorites Tools Help
Address www.4t.com
freeservers
Relax. Put your feet up.
Managing your website
shouldn't be an uphill climb.
...freeservers sets you FREE!


Sign Up - FreeServers - Microsoft Internet Explorer
Account Information
Please enter the information below.
*First Name: mahammad
*E-mail Address: mahammadymehdi@yahoo.com
Verify E-mail: mahammadymehdi@yahoo.com
Date of Birth: October 1987 (Month, Year)
*Gender M F
Country: Iraq
Zip/Postal Code: 00964
ناوی خۆت دەنوسیت
ئیمەیلەکەت
دوبارە ئیمەیلەکەت
بەرواری لە دایك بونت
جۆری ڕەگەزەکەت
وڵاتەکەت
زیپ کۆدی وڵاتەکەت

**لە هەنگاوی دواتردا پاسسۆردی تایبەت بە خۆتی بۆ دادەنێیت و دواتر ( submit ) دەکەین:**




**پاشان لەم بەشەدا چەن زانیاریەکت دەداتێ لە سەر ئەو سایتەی کە دروستت کردوە:**



**ئەمەش بەشی خوارەوەی پەڕەکەیە :**




**پاش ئەوەی کە (next)مان کرد ئەم بۆکسەی خوارەوەت پێ پیشان دەدات کە لەم بەشەی خوارەوەدا هاتووەتە سەر شاشەکە :**



ئێستا لەم بەشەی سەرەوەدا ئاگادارت دەکاتەوە کە ئێستا دەتەوێت سایتەکەت رێك بخەیت و کاری تیا بکەیت یان دواتر دەتەوێت ئەگەر ئێمە بمانەوێت لە ناو سایتەکەمان کاربکەین و بەشەکانی دابمەزرێنین کلیك لە (site builder) دەکەین ،و پاشان ئەم بەشەی خوارەوەمان بۆ دەکرێتەوە کە هەر شێوەیەکت بە دڵ بێت بۆ ستایل یان شێوەی سایتەکەت دەتوانی هەڵی بژێریت::




ئەمانەش چەند بەشێکی ترن لە شێوەی سایتەکان ،کام شێوەت بە دڵ بوو یەك کلیکی لێ دەکەیت:






**دواتر لەم بەشەی خوارەوەدا شوێنی نووسینەکان و وێنەکانی ناو سایتەکەمان دیاری دەکەین:**



**پاش ئەوەی کە دانەیەکیمان هەڵبژارد ئەم بەشەی خوارەوەمان بۆ دەکرێتەوە کە بریتیە لە ناو سایتەکەمان واتە دەچێتە ناو سایتەکەمان وە دەتوانین گۆڕانکاری تیا بکەین و نوسین و تایتڵی خۆمانی بۆ دابنێین:**




**بۆ نمونە ئەگەر بمانەوێت ئەو نوسینانەی ناو سایتەکە بگۆڕین ئەوا کلیك لە ( Edit ) دەکەین :**



# کاتێک بۆ یەکەمجار ئینتەرنێت بەکار دەهێنین

من لە سەرەتاوە باس لە ئینتەر نێت دەکەم بۆ ئەو کەسانەی کە هیچی لیٚ نازانن بەلاٚم ئەوانەشی کە لێی دەزانن سوودی لیٚ وەردەگرن و شتی زیاتر فێر بن .ئێستا سەرەتایەك لە بارەی چۆنیەتی کارکردن بە ئینتەرنێت و ئاشنا بوون لە گەڵیدا باس دەکەم:

لە پێش هەموو شتێك دەبێت ئایکۆنی ئینتەرنێت بناسینەوە و بزانین کە کامە ئایکۆنەکەیەتی پاشان دەبلٚ کلیکی لیٚ دەکەین:




بە دەبلٚ کلیك کردن لە سەری ئینتەرنێتمان بۆ دەکرێتەوە ئەگەر نینتەرنێتەکەمان هیچ کێشەیەکی تیا نەبێت و بە تەواوەتی (connect) بووبێت .

# چۆن زۆرترین خزمەت لەسایتی یاهوو وەردەگرین

**یەکێك لە سایتە خزمەتگوزاریە فراوانەکان بریتیە لە سایتی (yahoo) کە ئێوە سەرەتای فێربوونتان دەتوانن لەم سایتە فراوان و بەکەڵکە دەست پێ بکەن :**




**ئەم پەیجەی کە لە سەرەوە دەیبینن سایتی (yahoo) وە کە پاش ئەوەی کە ناونیشانەکەیمان لێ دا ئەم سایتەمان بۆ دەکرێتەوە.ئێستاش باسی چۆنیەتی نوسینی ناونیشان دەکەین یان ئەو سایتەی کە دەمانەوێت .هەر سایتێك کە بمانەوێت دەتوانین لە بۆشایی (address) دا بیان نوسین و دواتر بە فرمانی (GO) یان بە (Enter) دەچێتە ناو سایتەکەوە.**

بۆ نمونە ئەگەر بمانەوێت سایتێکی وەك سایتی ( yahoo ) بکەینەوە ئەوا سەرەتا لە بۆشایی ( address ) دا پێویستە بۆ هەکوو سایتێك ( www ) بنوسرێت کە کورتکراوەی ( world wide web ) ە بە واتای تۆڕی فراوانی جیهانی دێت کە ئەگەر بەم شێوەیە نەبێت ئەوا سایتەکەت بۆ ناکرێتەوە بۆیە پێویستە کە پاش ( www ) یەك خاڵ بنوسین بەم شێوەیە ( www.yahoo ) کە لە دوای سێ دەبلیو پێویستە خاڵێك دابنێین و دواتر ناوی تەواوەتی ئەو سایتەی کە دەمانەوێت بیدۆزینەوە. وە لە کۆتایی ناونیشانەکەش پێویستە بزانیت ئەو سایتە ( com. ) یان هتد و بینوسیت. کە ئەمانەش هەریەکە کورتکراوەیە کە بۆ نمونە ( com ) واتە ( company ) یان ( org ) واتە




( organization ) هتد......

تۆ لەم بۆشاییەدا ناوی سایتەکە دەنوسیت بۆ نمونە وەکو وتمان ( www.yahoo.com ) :

پاشان دوگمەی ( Enter ) دەکەین لە سەر کیبۆردەکەمان یان کلیك  لە دەکەین:






کەمێك چاوەڕێ دبین تاوەکو سایتەکەمان بۆ دەکرێتەوە، خێرایی کرانەوەی ئەم سایتانەش بەندە بە خێرایی هێڵی ئینتەرنێتەکەمان واتە تا هێڵی ئینتەرنێتەکەمان خێراتربێت ئەوا بە ماوەیەکی کەمتر سایتەکەت بۆ دەکرێتەوە.

هەموو کردارێك لە ئینتەرنێتدا لە دوو بەش پێك دێت ( send ) و ( receive ) واتە ناردن و وەرگرتن:

کاتێک کە سایتێک داوا دەکەین یان ناونیشانێک دەنوسین و ( GO ) دەکەین یان ( Enter ) دەکەین ئەو ناونیشانەی کە دەینوسین دەنێردرێت لە ڕێگەی ئەو هێڵەی کە هەمانە بۆ سێرڤەر پاشان ئەنجامەکەی وەردەگرینەوە ،وە هەر بەم شێوەیەش هەمیشە لە ناردن و وەرگرتندایت.

ئێستا دێینە سەر ناساندنی ئەو بەشە گرنگانەی کە هەمیشە لە کاتی بەکارهێنانی ئینتەرنێتدا پێویستیت پێ دەبێت:




ئێستە دێینە سەر باسکردنی ئەم بەشانەی خوارەوە:



 هەنگاوێک بۆ دواوە

 هەنگاوێک بۆ پێشەوە

 بۆ وەستاندنی پەیوەندی بە سایتەکانەوە،واتە ئەگەر تۆ سایتێکت لێ دابێت و ئینتەرت کردبێت وە دواتر پەشیمان بیتەوەو بتەوێت سایتێکی تر لێ بدەیت بە بێ ئەوەی کە چاوەڕێ بکەیت تا سایتەکە بە تەواوەتی بکرێتەوە دەتوانیت ئەم دوگمەیە بە کاربهێنیت و دەست بە جێ دەوەستێت و دەتوانیت لە بۆشایی ( address ) دا ناوی سایتێکی تر بنوسیت کە دەتەوێت.

بۆ دوبارە بوژاندنەوەی پەرە واتە ( Refresh ).

 ڕۆیشتن بۆ لاپەڕەی سەرەکی کە بە ( Home ) ناودەبرێت کە خۆمان دەتوانین چ سایتێک زۆر گرنگ بێت بە لامانەوەو هەمیشە بە کاری بهێنین داینێین بە ( Home ) واتە هەموو جار ئینتەرنێتمان کردەوە بەو سایتەی کە دامان ناوە دەست پێ دەکات.

Search بۆ گەڕان. ( سێرچ )

Favorites سایتە پەسەند کراوەکانمان یان ئەو سایت و ماڵپەڕانەی کە ئارەزومانە .

هەروەکو وتمان دۆزینەوەی سایتەکان زۆر زۆر کارێکی ئاسانە بەو شێوەی کە باسمان کرد هەموو کەسێك دەتوانێت کاری خۆی بکات لە سەر ئینتەرنێت بۆ دۆزینەوەی سایتەکان گەڕان بە دوایاندا .ئەگەر ئێمە هەرسایتێکمان بۆ دۆزینەوە پێویستە وەکو باسمان کرد ناونیشان و addressی سایتەکە بە تەواوەتی و بە بێ هەڵە بیزانین بۆ ئەوەی کە کاتێك لە بۆشایی ( address ) دا نوسیمان بە هەڵە سایتێکی ترمان بۆ نەهێنێت .سایتەکان ئەوەندە زۆرن کە لە ژماردن نایەن و بەردەوامیش لە زیاد بوندان لە بەر ئەوەشە کە هەندێ جار بە بچوکترین هەڵە لە ناونیشانی ئەو سایتەی کە دەمانەوێت سایتێکی ترمان بۆ دەهێنێت.

سەرەتا یەکێک لە کارە گرنگەکانی ئینتەرنێت چۆنیەتی دروست کردنی ئیمەیلە و چۆنیەتی کارپێکردنی

## چۆنیەتی دروست کردنی ئیمەیل (Email)

سەرەتا سایتی ( yahoo ) دەکەینەوە پاشان کلیك لە سەر ( Mail ) دەکەین:






ئەو دوو بۆشاییە کە شوێنی نوسینی ئیمەیلەکەمانەو وشەی نهێنیەکەی تەنها کاتێك دەبێت کە پێشووتر ئیمەیلمان دروست کردبێت وە دوای ئەوەی کە ئیمەیلەکەمان و وشە نهێنیەکەمان نوسی پێویستە کە Sign In بکەین بۆ کردنەوەی ئیمەیلەکەمان .بەڵام ئێستا باسی چۆنیەتی دروست کردنی ئیمەیل دەکەین کە بۆ ئەم کردارەش کلیك لە sign up دەکەین :



یان ئەگەر بەم شێوەیە بوو هیچ جیاوازیەکی نیە بەڵام ئێمە پێویستە بزانین کە (SIGN UP)بۆ دروست کردنی ئیمەیلێکی نوێ:

## پاش ئەوەی کە ( SIGN UP ) مان کرد ئەم پەڕەی ترمان بۆ دەکرێتەوە




به دڵنیاییەوە پێویستە کە هەموو ئەو بۆشاییانە پڕ بکەینەوە بە تایبەتی ئەوانەی کە ئەستێرەیەکی بچوك لە پێشیانەوەیە واتە دەبێت بە دڵنیاییەوە کە ئەو بۆشاییە پڕ بکرێتەوە.




**دواتر لە کۆتایی ئەم بەشەدا لەم بۆشاییەی خوارەوە ئەو کۆدە دەنوسین کە بە شێوەیەکی خواروخێچ نوسراوە پاشان کلیك لە (I gree) دەکەین:**



لە کۆتایی دا ئەم پەڕەیەمان بۆ دەکرێتەوە پاش ئەوەی کە ( I agree ) مان کرد:




ئەم پەڕەی کە لە کۆتاییدا دەبینین پێکهاتوە لە زانیاریە سەرەکیەکان سەبارەت بە ئەو ئیمەیلەی کە دروستمان کردوە:

وەك لێرەدا دەبینین کە ئەو ئیمەیلەی دروستمان کردوە ناونیشانەکەیمان پێ پیشان دەدات:

Your Yahoo! ID:
mahamadmehdi

Your Yahoo! Mail Address:
mahamadmehdi@yahoo.com

Your Alternate Email:
mahamadmehdi@company.com

لێرەشدا ئەو پرسیارە تایبەتیانەی کە هەڵت بژاردبوو و وە وەڵامەکەیت دابوووە پیشانت دەدرێت:

| Security Question:<br>What was the name of your first school? | Date of Birth:<br>October 10, 1987 |
|---|---|
| Your Answer:<br>zangini | ZIP/Postal Code:<br>00964 |

# گەڕان لە ئینتەرنێتدا (search)

بە هۆی ئەو هەموو خزمەتگوزاریە فراوانانەی کە لە ئینتەرنێتدا خراونەتە ڕوو دەتوانیت زانیاری سەبارەت بە هەرشتێك لە جیهاندا بتەوێت دەستت بکەوێت بە ئاسانی و بە خێراترین ڕێگا ،یان گەڕان بە دوای وێنە و هەواڵ و زانیاری بەسود و سایت دەتوانیت سوود لە خزمەتگوزاری هەندێ سایتی جیهانی و گرنگ بکەیت وەکو (yahoo,google.msn,ebay) وهتد ....

بۆ سوود وەرگرتن لەم خزمەتگوزاریانە دەتوانیت زۆ ئاسانی هەرچیەکت بیەوێت بیدۆزیتەوە ئەویش بە نوسینی ئەو بابەتەی کە دەتەوێت لە (yahoo search ,Google search)دا.وە ئێمەیش بۆ ئەم مەبەستەش باس لە خزمەتگوزاری (Google search) دەکەین و چۆنیەتی گەڕان بە وردی و خێرایی :

سەرەتا سایتی (Google) دەکەینەوە ئەویش بە نوسینی (www.Google.com) لە بۆشایی (address) وە لە پاش کردنەوەی پەڕەی سەرەکی ئەم سایتە چەند خزمەتگوزاریەکی گەڕانی هەیە وەکو (web ) کە بۆ سایت دەگەڕێت و(image ) بۆ وێنە دەگەڕێت و(groups) کە بە کۆمەڵ واتە هەرچیەك لە بارەی ئەو شتەی دەینوسیت دەهێنێت و(news)یش بۆ هەواڵ و زانیاری نوێیە لە بارەی ئەو شتەی دەینوسیت.

بۆ نمونە ئەگەر ئێمە لەو بۆشاییەدا وشەی (computer) بنوسین و کلیك لە (web) بکەین ئەوا هەرچی سایتە لە بارەی کۆمپیوتەرەوە بۆمان دەدۆزێتەوە ،ئێمە پاش ئەوەی کە وشەی (computer) مان نوسی کلیك لە Google Search دەکەین



پاش ئه‌وه‌ی كه‌ كلیكمان له‌ (Google search) كرد ئه‌وا ده‌ست ده‌كات به‌ دۆزینه‌وه‌ی ئه‌و بابه‌ته‌ی كه‌ ده‌مانه‌وێت وه‌كو ئه‌وه‌ی كه‌ له‌ خواره‌وه‌ ده‌یبینین ،ئێستا دێینه‌ سه‌ر باسكردنی وردی ئه‌و ئه‌نجامه‌ی بۆی به‌ ده‌ست هێناوین:






ئەم سایتە ئەوەندە خزمەتگوزاری نوێو بە کەڵکی تێدایە کە تۆ هەرچیەکت بوێت یان هەر زانیاریەکت بیەوێت دەتوانیت بە خێراترین کات دەستت بکەوێت،و ئەم دۆزینەوانەش بە شێوەیەکە کە ئەو بابەتەی کە تۆ دەینوسیت لە بۆشاییەکەدا بۆ نمونە ئێمە (computer)مان نوسی ئەوا لە هەر شوێن و سایتێکدا یان تەنانەت لە ڕستەیەکدا وشەی (computer) ی تیا بێت بۆ مان دەهێنێت. و یەکێکی تر لە خزمەتگوزاریە گرنگەکانی تری ئەم بەشە (definition) ە کە وەکو وتمان تایبەتە بە ناساندنی وردی ئەو بەشەی کە نوسیوتە واتە ئەو شتە شی دەکاتەوەو بە جوانی بۆت باس دەکات تەنانەت فەرهەنگی تایبەتیشی تێدایە سەبارەت بەو وشەی کە نوسیوتە و چۆنیەتی خوێندنەوەی ئەو وشەیە.

**ئەگەر ئێمە بەشێکی ترمان هەڵبژارد واتە ئەگەر کلیکمان لە ( image ) کرد ئەوا بۆ وێنە دەگەڕێت لەو بابەتەدا کە نوسیوتە :**




**وە ئەگەر بمانەوێت لە ڕووی زانستیەوە لە هەرشتێك بکۆڵینەوە ئەوا کلیك لە ( definition ) دەکەین ئەگەر بمانەوێت سوود لەم خزمەتگوزاریە وەربگرین ئەوا بۆ نمونە ئەگەر بنوسین ( earth ) واتە زەوی ئەوا پاش ئەوەی کە بابەتەکانی بۆ دۆزینەوە کلیك لە ( definition ) دەکەین :**



وە بۆ گۆڕینی زمان لە سایتی (Google) دا پاش ئەوەی کە سایتەکەمان کردەوە کلیك لە (language tools) دەکەین پاشان کلیك لەو زمانە دەکەین کە دەمانەوێت ،بۆ نمونە بۆ گۆڕینی زمان لە (Google) دا بۆ کوردی ئەم کردارانە جێبەجێ دەکەین:




دواتر ئەو زمانەی کە دەمانەوێت هەڵیدەبژێرین :



# بینینی نەخشەی جیهان بە جوانترین شێوە لە ڕێگەی (Google earth)

(Google earth) یەکێکە لە گەورەترین خزمەتگوزاریەکانی سایتی (Google) کە دەتوانین لە ڕێیەوە نەخشەی هەرشوێنێکی جیها نمان بوێت ببینین کە ئەو وێنانەش وێنەی ڕاستین و لە ڕێگەی مانگە دەسکردەکانەوە گیراوە .
وە ئێمەش بۆ بەکارهێنانی ئەم خزمەتگوزاریە پێویستە کە سەرەتا بەرنامەکەی لە ڕێگەی سایتەکەیەوە دابەزێنین واتە (Down load) ی بکەین بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە ئەم کارانە بکەین:

سەرەتا پێویستە کە ناونیشانی سایتەکە بنوسن کە (www.googleearth.com)




پاش ئەوەی کە سایتەکەمان بۆ کرایەوە کلیك لە (Downloads) دەکەین بۆ ئەوەی کە بەرنامەی (Google earth) دابەزێنینە ناو کۆمپیوتەرەکەمانەوە ، پاشان لە ناو کۆمپیوتەرەکەمان دیسان (set up) ی دەکەین ئینجا کاردەکات.




دواتر لەم بەشەدا ( windows 2000 xp ) دیاری دەکەین و کلیك لە Download Google Earth دەکەین :





ئێستا کلیك لە ( save ) دەکەین بۆ ئەوەی ئەو پرۆگرامە خەزن بکەین و هەڵیبگرین لە ناو کۆمپیوتەرەکەمانەوە:



**دواتر ئەو شوێنە دیاری دەکەین کە بەرنامەکەی تیا ( Download ) بکەین :**




**ماوەیەك چاوەڕێ دەبین تاوەکو بەرنامەکە ( download ) بێت :**



دواتر دەچینە ئەو شوێنەی کە بەرنامەکەمان تیا دابەزاندووە دەبڵ کلیك لەو ئایکۆنە دەکەین کە ( Download ) بووە:







لەم بەشەدا زمانەکان دیاری دەکەین کە ئێمە زیاتر زمانی ئینگلیزی بەکاردەهێنین ،یەك کلیك لە ( English ) دەکەین و ( next ) دەکەین:




پاشان (next) یکی تر دەکەین بۆ بەردەوامبونمان:

وە لەم بەشەدا کلیك لە

I accept the terms of the license agreement

دەکەین و پاشان (next) یکی تر دەکەین بۆ چونە هەنگاوی دواتر:







لـــــەم بەشـــــەدا (Complete) هەڵدەبـــــژێرین و (Next) دەکەین:




له دوا هەنگاودا كليك له ( next ) دەكەين و پاشان ماوەيەك چاوەڕێ دەبين تاوەكو بەرنامەكە ( install ) بێت..



پاش ئەوەی کە بەرنامەکە بەتەواوی ( install ) بوو کلیك لە ( Finish ) دەکەین بۆ کۆتایی هێنان بە کارەکە :




دواتر بەرنامەکە دەکەینەوە بە دەبڵ کلیك کردن لە سەر ئایکۆنی بەرنامەکە :



تێبینی/ ئەم بەرنامە پێویستی بە ئینتەرنێت هەیە بە بەردەوامی واتە بە بێ ئینتەرنێت ئیش ناکات بۆ یە کە هەرکاتێک ئەم بەرنامەت کردەوە پێویستی بە ئینتەرنێتە لەبەر فراوانی و گەورەیی قەبارەی ئەم بەرنامە کە هەرکات ئەم بەرنامەشت بەکارهێنا و نەخشەی شوێنێکت ویست ببینی ئەوا وردە وردە دەردەکەوێت واتە پێویستە کە ماوەیەکی کەم چاوەڕێ بکەین تا نەخشەکە بە تەواوی ساف و ڕوون دەبێت.



وە بۆ دۆزینەوەی ناوچەیەکی سەر زەوی دەتوانین بە سەهمی ماوسەکە کە دەبێت بە دەستێک زەوی بسوڕێنینەوەو بیخەینە سەر ئەو ناوچەی کە دەمانەوێت پاشان بە هۆی سکرۆڵی ماوسەکەمانەوە دەتوانین کوێمان بوێت بیهێنینە پێشەوە ...

وە هەر بە سکرۆڵی ماوسەکەمانیش دەتوانین بیهێنینە دواوە مە بە پێچەوانەوە بیسوڕێنینەوە .

یان بە شێوەیەکی تر دەتوانین هەر وڵاتێک یان ناونیشانی هەرشارێکمان بوێت بیدۆزینەوە ئەویش بە نوسینی ناوی ئەو وڵاتە یان ئەو شارەی کە دەمانەوێت بیدۆزینەوە لە بۆشایی ( Fly to ) کە لە بەشی سەرەوەی بەرنامەکەدا یە

وە ئەمانەو چەندین تایبە تمەندی تری ئەم بەرنامە کە لەگەڵیدایە دەتوانیت سوودی لێ وەربگرێت بۆ بینینی هەرناوچەیەکی جیهان بە جوانترین شێوە.

# سایتێك بۆ دابەزاندنی بەرنامە بە خۆڕایی

یەکێك لە سایتە فراوانە خزمەتگوزاریەکان سایتی (www.download.com) ە کە لە ڕێگەی ئەم سایتەوەو دەتوانیت زۆرترین بەرنامەی بەسوود دابەزێنیت .ئێستا بۆ چونە ناو ئەم سایتە ناونیشانەکەی دەنوسین و (enter) دەکەین:



پاش ئەوەی کە سایتەکەمان بۆ کرایەوە ئێمە دەتوانین ناوی ئەو بەرنامەی کە دەمانەوێت لە بۆشایی (search) دەینوسین پاشان (Go) دەکەین:



بۆ نمونە ئێمە بەرنامەی (paint) دەنوسین لە بۆشاییەکەدا ئەوا هەرچی بەرنامەیە سەبارەت بە وێنە کێشان و وێنە بۆ مان دەهێنێت:




ئینجا کام بەرنامەمان ویست لەو بارەیەوە کلیك لە **Download Now** دەکەین :



**دواتر شوێنەکەی بۆ دیاری دەکەین و ( save ) دەکەین.**




**پاشان ماوەیەك چاوەڕێ دەبین تاوەکو بەرنامەکە بە تەواوی ( download ) بێت.**

**بەم شێوەیە هەر بەرنامەیەکمان بوێت دەتوانین دەستمان بکەوێت لەم بەرنامەدا بە خێرایی وە زۆر جار ئەگەر ناوی بەرنامەکەش نەزانین دەتوانین لەو بارەی کە دەمانەوێت شتێك بنوسین ،بۆ نمونە ئەگەر بنوسین ( file converter ) ئەوا ئەو بەرنامانەمان بۆ دەهێنێت کە تایبەتن بە گۆڕینی جۆری فایل و هتد.**



# چۆنیەتی دابەزاندنی بەرنامەی (yahoo messenger)

سەرەتا سایتی ( yahoo ) دەکەینەوە پاشان کلیك لە ( messenger ) دەکەین :




دواتر کلیك لە Get it now دەکەین:



پاشان کلیك له Get Started دهکهین :




کلیك له ( save ) دهکهین بۆ خهزن کردن و ههڵگرتنی بهرنامهکه له ناو کۆمپیوتهرهکهمان :






ێرەدا شوێنێکی بۆ دیاری دەکەین لە ناو کۆمپیوتەرەکەمان بۆ خەزن کردنی بەرنامەکە :




پاش ئەوەی کە بە تەواوی (download) بوو کلیک لە (open folder) دەکەین بۆ کردنەوەی فۆڵدەری تایبەت بە بەرنامەکەمان :




ئەمەی کە دەیبینن لە وێنەکەدا وێنەی ناو ئەو فۆڵدەرەیە کە بەرنامەکەی تیا دابەزیوە و ئێستا پێویستە کە دەبڵ کلیک بکەین لەو ئایکۆنە بۆ ئەوەی کە (install) ی بکەینە ناو کۆمپیوتەرەکەمان :




**پاش ئەوەی کە دەبڵ کلیکمان کرد لە سەر ئایکۆنی بەرنامەکە ئەم بۆکسەمان بۆ دەکرێتەوە لێرەشدا کلیک لە** 

**دەکەین :**

**کلیک لە ( next ) دەکەین :**



(next) یکی تر دەکەین:




لێرەدا کلیک لە Yes, I accept the License Agreement terms above, and the Yahoo! Terms of Service at: دەکەین و

(next) یکی تر دەکەین:






لە کۆتا هەنگاودا کلیك لە [Install >] دەکەین ،وە لەم بەشەدا زانیاریت دەداتێ لە سەر قەبارەی بەرنامەکەو ماوەی پێویست بۆ دابەزاندنی بەرنامەکە :




ماوەیەك چاوەڕێ دەبین تاوەکو بە تەواوی بەرنامەکە ( install ) دەبێت پاشان دەتوانین بە ئاسانی بەرنامەکە بە کاربهێنین .



YAHOO!

# چۆنیەتی (save) کردن واتە خەزنکردنی پەڕەی ئینتەرنێت یان خەزنکردنی وێنە لە سەر ئینتەرنێت:

**خەزن کردنی پەڕەی ئینتەرنێت بۆ ناو کۆمپیوتەرەکەت کارێکی زۆر ئاسانە وە دەتوانیت چ سایتێکت بوێت لە لای خۆت خەزنی بکەیت،وە وێنە و ڤیدۆییش دەتوانیت بە ئاسانی خەزن بکەیت بەلاّم بۆ ڤیدۆیی و دەنگ هەندێ سایت هەیە کە ناتوانیت ڤیدۆیی و دەنگی لێ وەربگریت چەنگە ڕێگەی پێ نەدراوە:**

**بۆ نمونە ئەمە سایتێکە کە کردومانەتەوە ،بۆ ئەوەی کە خەزنی بکەین پێویستە ئەم کارانە بکەین:**




**بۆ خەزن کردنی ئەم پەڕە کلیك لە ( file ) دەکەین و کلیك لە ( save As ) دەکەین:**



**دواتر شوێنێکی بۆ دیاری دەکەین لە ناو کۆمپیوتەرەکەمان و کلیك لە ( Save ) دەکەین:**




**دواتر کەمێك چاوەڕێ دەبین تاوەکو پەڕەکەمان بە تەواوەتی خەزن دەبێت:**



## بەلام بۆ خەزن کردنی وێنەیەك لە ناو ئینتەرنێتدا ئەم کارانە دەکەین:

**کلیکێك لە سەر وێنەکە دەکەین و پاشان کلیك دەکەین لە سەر (آیکۆن) دەکەین بۆ خەزنکردنی و وەکو وانەکانی پێشوو شوێنێکی بۆ دیاری دەکەین و ( save ) ی دەکەین :**




**یان کلیکێکی ڕاست لە سەر وێنەکە دەکەین و دەیخەینە سەر ( Save Picture As ) و شوێنێکی بۆ دیاری دەکەین و ( SAVE ) دەکەین.**



# بەرنامەی یاهوو ماسینجەر

# (yahoo messenger)

بەرنامەی (yahoo messenger) یەکێکە لە بەرنامە گرنگەکان لە بواری پەیوەندی کردندا کە ئێمە دەتوانین لە رێیەوە بە ئاسانی پەیوەندی راستەوخۆی تێکستی و دەنگی و ڤیدۆیی پێ ئەنجام بدەین لە هەر شوێنێکی جیهاندا...

وە ئێستاش ئێمە دێین بە کورتی باس لەم بەرنامەیە دەکەین:




پاش دابەزاندن( install ) کردنی ئەم بەرنامە کە دەتوانین لە رێگەی ئینتەرنێتەوە بێت کە لە رێگەی خودی ئەم سایتەوە کە (yahoo) وە یان لەرێگەی CD یەوە دایبەزێنینە ناو کۆمپیوتەرەکەمانەوە بە تایبەت ئەو CD یانەی کە بەشی تایبەتی تێدایە بە ئینتەرنێت ،وەك ئەوەی دەیبینن لەم وێنەیەی سەرەوەدا ،دەبڵ کلیك دەکەین لی سەر ئایکۆنی بەرنامەکە بۆ کردنەوەی ،.

## پاش ئەوەی کلیکمان لێ کرد ئەم بەشەمان بۆ دەکرێتەوە:




ئەگەر ئیمەیلمان نەبوو ئەوا کلیك لێرە دەکەین بۆ دروستکردنی ئیمەیلیکی نوێ.

ناونیشانی ئیمەیلەکەمان لێرە دەنوسین.

وشەی نهێنی ئیمەیلەکەمان لێرە دەنوسین.

بۆ چونە ناو بەشی تایبەت بە ئیمەیلەکەمان واتە داخلبوون بە ئیمەیلەکەمان




**بیر خستنەوەی ناونیشانی ئیمەیلەکەو وشەنهێنیەکەمان پاش داخستنەوەی بەرنامەکە**

**چونە ناو بەرنامەکە بە شێوەی ئۆتۆماتیکی.**

**بۆ چونە ناو بەرنامەکە بە شێوەیەك کە دیار نەبیت لە ناو بەرنامەکە واتە پاش ئەوەی داخلی چاتەکە بوویت کەس ناتبینێت واتە کەس نازانێت کە داخڵ بوویت یان نا بە تایبەت ئەوانەی کە هاورێتن و ئیمەیلکەتیان هەیە .**

ئێستا ئێمە دێین لە سەرەتاوە باسی لێوە دەکەین بۆ نمونە تۆ ئێستا ئیمەیلت نیە بۆ ئەوەی ئیمەیلی تایبەت بە خۆت دروست بکەیت کلیك لە Get a Yahoo! ID




کلیك لەم بەشە دەکەین بـــۆ دروســـت کردنـــی ئیمـــەیلێکی نـــوێ و بـــۆ جونە ناو ئەم بەرنامە.

دواتـــــر کــــەمێك جـــاوەروان دەبین..



**لەم بەشەدا ئەم بۆشاییانە پڕ دەکەینەوە :**







**پاشان کەمێکی تر چاوەڕوان دەبین..**

دواتر لەم بەشەدا چەند ناوێكت دەداتێ بۆ ناوی ئیمەیلەكەت كە دەتوانیت بە ئارەزوی خۆت یەكێكیان هەڵبژێریت یان ئەگەر هیچانیشت بە دڵ نەبوو ئەوا دەتوانیت خۆت لە بۆشایی ( create my own ) دا چ ناوێكت پێ خۆشە بینێیت بە مەرجێ ئەو ناوە نەبێت واتە كەسێكی تر ئەو ناوەی هەڵنەبژاردبێت و لە بۆشایی خوارتریش وشەیەكی نهێنی یان ژمارەیەكی نهێنی بۆ ئیمەیلەكەت دادەنێیت و دواتر ( next )دەكەیت...






ئەم بەشە تایبەتە بە پاراستنی وشە نهێنیەکەت لە کاتێکدا ئەگەر هاتوو ونت کرد.کە ئەمیش بە پڕ کردنەوەی ئەم خانانەی خوارەوە دەبێت:







تێبینی:کاتێك کە ناوی ئیمەیلەکەمان دەنوسین پێویستە ئاگاداری ئەوە بین کە ئەگەر بۆشایی لە نێوان ناوەکەی خۆت و باوکت هەیە وەك(-)یان(_)دەبێت لە یەکیان جیا بکەینەوە واتە بزانە کە کامیانە و هەمیشە دەبێت ئەوە لێ بدەیتەوە.(-+ shift)=(_) وە بۆ (-)تەنها پەنجە دەنێین بە دوگمەی (-) لە سەر کیبۆردەکەمان.

**دواتر چی نوسراوە لەو بۆکسەی خوارەوەدا ئێمە دەینوسینەوە لە بۆشاییەکەدا و پاشان (naxt) دەکەین؛**




**لە دوا هەنگاودا کەمێکی تر چاوەڕێ دەبین...**




**پاشان لە کۆتایی دا (finish) دەکەین.**



ئێستا ئامادەین بۆ ئەوەی کە بچینە ناو بەرنامەکەوە ...

پاش ئەوەی کە ئیمەیلەکەمان نوسی لە گەڵ وشە نهێنیەکەمان کلیك لە ( sign in ) دەکەین :




ئێستا داخلی بەرنامەکە بوین،.




ناوی ئەو ئیمەیلەیە کە بە هۆیەوە داخلی بەرنامەکە بویت ( ئیمەیلەکەت )

**ئێستا چەند رێگەیەكمان هەیە بۆ چونە ناو بەشی ( روومەكان ) ژوورەكان :**

**١/بۆ نمونە دەچینە سەر بەشی ( Messenger ) و دواتر ( Yahoo chat ) و دواتریش ( Join a Room ) :**




**٢/یەك كلیك لەم بەشە دەكەین و ( Chat ) هەڵدەبژێرین :**



پاش ئەوەی بەشی ( chat ) یان ( join a room ) مان هەڵبژارد ئەوا دەچینە بەشی ژووری چاتەکان ( chat room ) کە بە چەندین بەش پێك هاتووە وەك( music , games, family and home ,romance ,voice chat,…htc ) هتد کە هەریەکێکیان تایبەتە بە بەشێك بۆ نمونە ئێمە ئەگەر بمانەوێت بچینە بەشی چاتی دەنگی و رەنگی،ئەوا دەچینە ( voice chat )..کە بە دەبڵ کلیك لە هەریەکەیان دەچێتە بەشەکەوە..




پاش ئەوەی کە بەشەکانمان دیاری کرد ئەوا هەرچی ڕوومەکانە پێمان پیشان دەدات و ئێمە دەتوانین بە ئارەزوی خۆمان یەکێکیان هەڵبژێرین....






کەمێک چاوەڕێ دەبین و پاشان وەک ئەم وێنەی خوارەوەی لێ دێت و ئێمەش بۆ چونە ناو ڕوومەکە کلیک لە (ok) دەکەین:




دواتر وەکو ئەم وێنەی خوارەوە دەبینن کە دەچێتە ناو ڕوومەکەوە و ئێستا دەتوانین چ کەسێکمان بوێت هەڵی بژێرین و گفتوگۆی لەگەڵدا بکەین




**ئێستا دێینە سەر باسکردنی بەشەکانی :**

**ئەگەر کلیکێکی لێ بکەین ئەوا چەندین جۆرو ڕوخسارمان پیشان دەدات کە هەر یەکەیان گوزارشت لە شتێک دەکات بە شێوەی وێنەی بچوکی دروست کراو( Clip Art ):**



**بۆ گۆڕینی شێوەو قەبارەو ڕەنگی نوسینەکەمان :**

**پاش ئەوەی کە کلیکێکی لێ بکەین وەك ئەم وێنەی خوارەوەی لێ دێت:**




**وە ئەگەر بمانەوێت شتێك بنوسین و هەموو ئەو کەسانەی کە لە ڕوومەکەدان ببینن یان ئەوانەی لە ڕووی دەرەوەی ڕوومەکەدان ببینن ئەوا لەو بۆشاییەی کە لە بەشی خوارەوەی ڕوومەکەدا هەیە شتێك دەنوسین و کلیك لە ( Send ) دەکەین:**



ە ئەگەر بمانەوێت گفتوگۆ لەگەڵ یەکێك لە ئەندامانی ناو ڕوومەکە بکەین ئەوا هەرکامێکیا ئمان بوێت دەبڵ کلیکی لێ ەکەین و دواتر دەچنە بەشی تایبەت بە خۆتان واتە هەر تەنها خۆت و ئەو کەسەی گفتوگۆی لەگەڵ دەکەیت دەمێننەوە :






**کە چوینە بەشی تایبەتەوە لە ڕوومەکەدا ئەوا لێرەشدا چەندین تایبە تمەندی هەیە بۆ ئاڵوگۆڕکردنی وێنە یان هەر فایلێك یان بینینی ئەو کەسە بە دەنگ و ڕەنگەوەو هتد....**




**وە ئەگەر بمانەوێت نامە ناردن لەو کەسەی کە لەگەڵی گفتوگۆدەکەین بۆنێمە بوەستێت ئەوا کلیك لە (Ignore) دەکەین ،واتە لە دوای ئەوەی کە کلیکمان لەم دوگمەیە کرد نامە لە لایەن ئەو کەسەوە وەرناگیرێت.**



وە ئەگەر بمانەوێت ئەو کەسەی کە لەگەڵی گفتوگۆ دەکەین بکەینە هاوڕێی خۆمان یان بیخەینە لیستی ئەو هاورێیانەی کە تۆمارمان کردوە لە ئیمەیلەکەی خۆمان ئەوا کلیك لە (Add) دەکەین؛




ئێستا دێینە سەر بەشێکی تر کە (Conference ) ە کە بەکاردێت بۆ داوەتکردن( بانگهێشتکردنی )ئەو هاورێیەی کە لە گەڵی گفتوگۆ دەکەیت بۆ ڕوومێکی نوێ کە بتەوێت چەند هاورێیەکی خۆت لەو ڕوومە نوێیە دا کۆ بکەیتەوەو بانگیان بکەیت ،کە بەم شێوەیە دەبێت؛



پاش ئەوەی کە یەك کلیکمان لێ کرد دەچینە ئەم بەشەوە کە دەتوانیت بەم شێوەیە هاوڕێکانت بانگهێشت بکەیت بۆ ڕوومیکی نوێ:




لەم لیستەدا ناوی ئیمەیلی ئەو هاوڕێیانەت نوسراوە کە ئێستا لە سەر خەتن.

بۆ هێنانن( زیادکردن )ی ئەو هاوڕێیەی کە بانگی دەکەیت بۆ ڕوومە نوێکە.

بۆ سڕینەوەو لابردنی ئەو هاوڕێیەی کە بانگت کردووە لە ڕوومەکەدا.

لە کۆتایی دا ئەم دوگمەیە دەکەین بۆ بانگکردنی هاوڕێکانت.




دێینە سەر بەشێکی گرنگ لە بەرنامەکەدا ئەویش ناردنی وێنەو فایل و هەرچیەك کە بتەوێت بۆ ئەو کەسەی کە لەگەڵێدایت لە بەرنامەکەدا کە ئەویش هەروەها دەتوانێت بۆت بنێرێ.

بەشی یەکەمیان بۆ ناردنی وێنەیە بەلام ئێمە لەگەڵ بەشی دواتری باسی لێوە دەکەیت کە هەمان ئیش دەکات:

نیستا دێینه سەر بەشی ناردنی فایل ڕاستەو خۆ لە ڕێگەی ئەم بەرنامەوە بۆ ئەو کەسەی کە لەگەڵتدایە وە هەروەها ناردنی وێنەش کە لە بەشی سەرەوەدا باسمان نەکرد چونکە لێرەش دوبارە دەتوانیت زۆر بە ئاسانی وێنەو هەرفایلێك بتەوێت بینێری ئەویش بەم شێوەیە دەبێت:

سەرەتا کلیك لە ( Send File )دەکەین:




دواتر هەر فایلێك کە دەمانەوێت بینێرین دیاری دەکەین و ( open ) یان دەبڵ کلیکی لێ دەکەین ،بۆ ناردنی بۆ نمونە ئێمە دەمانەوێت وێنەیەك بنێرین :سەرەتا دە چینە ئەو شوێنەی کە وێنەمان تیا هەڵگرتوە یان وێنەمان تیا خەزن کردومو پاشان دەبڵ کلیك لەو وێنەیە دەکەین کە دەمانەوێت بینێرین:



وە دوای ئەوەی کە ئەو فایلە یان ئەو وێنەیەی کە دەمانەوێت بینێرین دیاریمان کردو دەبڵ کلیکمان کردلەسەری یان (OPEN) مان کرد ئەوا لە ڕوومەکەدا دیارە کە دەینێرین وە وێنەکەش یان ئەو فایلە بە بچوکی دەردەکەوێت وەك ئەوەی کە لەم وێنەی خوارەوەدا دیارە:




بەشێکی تر بریتیە لە بەشی (Games) کە دەتوانیت یاری ڕاستەو خۆ لەگەڵ ئەو هاوڕێیەتدا بکەیت کە لەگەڵتایە ڕاستەو خۆ لە سەرخەتوە لەم بەشەشدا چەند جۆرە یاریەکی تێدایە وەکو (Chess) شەترەنج و (Pool) بلیارد و هتد، کە تەنها یەك کلیکی لەسەر (Games) دەکەین دواتر جۆری یاریەکە دیاری دەکەین:



ئێستا دێینە سەر بەشی کامێرا لە (Yahoo Chat) دا کە پاش ئەوەی کە دڵنیا بووین لەوەی کە کامێراکەمان کاردەکات یان ناسێنراوە بە کۆمپیوتەرەکەمان( تعریف )کرابێ یەک کلیک لە بەشی کامێرا دەکەین و پاشان (Ok) دەکەین و دواتر کامێراکەمان دەکەوێتە کار:




پاش ئەمە دێینە سەر بەشی دەنگ کە ئەمەش بە کاردەهێنرێت بۆ پەیوەندی ڕاستەوخۆی دەنگی نێوان تۆو ئەو کەسەی کە دەتەوێت قسەی لەگەڵ بکەیت، کە ئەمەش دیسان بە یەک کلیک کردن لە سەری دەبێت:



پاش ئەوە کلیك لە (OK)دەکەین بۆ کردنەوەی پەیوەندی دەنگی:




دواتر بۆ تاقی کردنەوەی مایك و هیدفۆنەکەت بۆ ئەوەی کە بزانیت هیچ کێشەیەکی تیا نیە ئەم تاقی کردنەوەیە دەکات ،ئێمەش (Next) دەکەین بۆ تاقی کردنەوەی :




لە یەکەم هەنگاودا مایکرۆفۆنەکەت تاقی دەکاتەوە کە پاش دەربڕینی هەر دەنگێکەوە دەبێت لەلایەن تۆوە:



دوا هەنگاو دەنگێك دەکەوێتە کار بۆ ئەوەی کە بزانیت گوێت لێیە ،واتە بزانیت هێدفۆنەکەت کاردەکات و هیچ کێشەیەکی نیە، پاشان کلیك لە ( Finish ) دەکەین:






# پێداویستیەکانی جیهانی مۆبایل لە ئینتەرنێتدا:

**چەندین یاری (Game) ی نەبڕاوە وخۆڕایی بۆ مۆبایل :**

**یەکێك لە گرنگترین و بەناوبانگترین سایت بۆ یاری مۆبایل سایتی (Game Jump)ە کە تۆ دەتوانی بە ئاسانی پاش دیاری کردنی جۆری مۆبایلەکەت چ یاریەکت بوێت بە خۆڕایی و بە بێ بەرامبەر دابەزێنیتە مۆبایەکەتەوە یان دابەزێنیتە کۆمپیوتەرەکەتەوە پاشان بیگوازیتەوە بۆ ناو مۆبایلەکەت،سەرەتا بۆ چونە ئەم سایتەوە ئەم ناونیشانە لێ دەدەین(www.gamejump.com) :**



**پاش ئەوەی سایتەکەمان بۆ کرایەوە پێویستە لە یەکەم هەنگاودا خۆمان بکەین بە ئەندامی ئەم سایتە بۆ ئەوەی کە هەموو جارێك بتوانین لە ڕێگەی ناوی خۆمان و وشەی نهێنی خۆمان بچینە ناو بەشی تایبەتی سایتەکەو بە ئاسانی و بە خۆڕایی کام یاریمان بوێت داونلۆدی بکەین.**

**بۆ ئەندام بوون لەم سایتەدا کلیك لە (join for FREE now) دەکەین:**




**پاش ئەوە ئەم فۆرمە پڕ دەکەینەوە بۆ بە ئەندام بوونمان :**






ناوی خۆت یان (ئەو ناوەی کە خۆت هەڵی دەبژێری بۆ خۆت)

وشەیەکی نهێنی بۆ خۆت دادەنێیت.

دوبارە هەمان وشەی نهێنی دەنوسیتەوە کە لە سەرەوە نوسیت.

پرسیارێك بۆ خۆت هەڵدەبژێریت .

وەلامەکەشی لێرە بنوسەرەوە بۆ نمونە تۆ پرسیاری (First school)ت هەڵبژاردوە واتە یەکەم خوێندنگات ناوی چی بوە ،وە تۆش وەلامەکەی لێرەدا دەنوسیت.

بۆ نمونە وەك ئەم شێوە پڕی دەکەینەوە:







لە دوەم هەنگاودا لەم شوێنەدا ناوی خۆت دەنوسیت.

ناوی دواتزت (ناوی باوکت).

ئیمەیلەکەت لێرەدا دەنوسیت.

دوبارە ئیمەیلەکەت دەنوسیتەوە .

وەك ئەم شێوەیە پڕی دەکەینەوە:




لە سێیەم هەنگاودا بەم شێوەیە پڕی دەکەینەوە:

بەرواری لە دایك بوونت.

جۆری رەگەزەکەت.

ناوی ولاتەکەت.

کۆدی ولاتەکەت.

کۆمپانیای گواستنەوە ،ئێمە (T-Mobile) هەڵدەبژێرین.

ژمارەی مۆبایلەکەت.



**پاشان کلیك لەم بەشە دەکەین و دواتر کلیك لە Join Now دەکەین:**




**لە کۆتایی دا بەم شێوەیە بویتە ئەندام لەم سایتەدا وە پاش ئەمە باس لە چۆنیەتی دابەزاندنی یاریەکان دەکەین.**



**وە دواتر لەم بەشەی خوارەوەدا جۆری مۆبایلەکەت دیاری دەکەیت واتە ناوی مۆبایلەکەت:**

**لە بەشی یەکەم دا ( All ) هەڵدەبژێرین .**

**وە لە بەشی دوەمدا( جۆری مۆبایلەکەت ) واتە ناوی کۆمپانیاکەی وەك( Nokia,Samsung,LG، هتد )**

**وە دواتر کلیك لە ( Advanced Device ) دەکەین:**




**پاشان مۆدیلی مۆبایلەکەت دیاری دەکەیت:**



**کە زۆربەی مۆدیلەکانی موبایلی تێدایە پاش ئەوەی مۆدیلی مۆبایلەکەشت دیاری کرد جۆری ئەو یاریەی کە دەتەوێت دەست نیشانی دەکەیت :**




**بۆ نمونە ئەگەر بتەوێت ئەم یاریە دابەزێنیت یان ( Download ) ی بکەیت ئەوا کلیك لە دەکەین :**




**پاش ئەوەی کە کلیکمان لە ( Download ) کرد ئەوا ئەم پەڕەی خوارەوەمان پێ نیشان دەدرێت ،وە پێویستە هەردوو فایلی (JAD,JAR) دابەزێنینە کۆمپیوتەرەکەمانەوە بۆ ئەوەی کە یاریەکە کار بکات . پاشان گواستنەوەی یاریەکە لە کۆمپیوتەرەکەمانەوە بۆ ناو مۆبایەکە بەهۆی ( Bluetooth ) یان ( Memory ) مۆبایلەکەوە:**



**پاش ئەوەی کلیکمان لە هەریەك لەو دوو فایلە کرد ئەوا ئەم بۆکسەی خوارەوەمان دێتە پێش چاوو کلیك لە ( Save ) دەکەین بۆ خەزنکردنیان :**




# (Mobile9) سایتێکی زۆر گرنگ و بەناو بانگ بۆ دابەزاندنی هەرچی پێداویستەکانی مۆبایلە بە خۆڕایی:

**سەرەتا ئەم ناونیشانە لێ دەدەین( www.Mobile9.com ) :**



پاشان کلیك لە DOWNLOADS دەکەین بۆ داونلۆدکردن یان دابەزاندنی هەر پێداویستیەکی مۆبایل:



دواتر ئەو بەشەی کە دەتەوێت هەڵی دەبژێریت بۆ نمونە بەرنامەت دەوێت (Software)یان یاری کە (Game) ە یان باگراوند بۆ مۆبایلەکەت یان ئاواز و هتد...



**بۆ نمونە ئێمە کلیکمان لە بەشی (Software) کرد کە بەشی بەرنامەکانی مۆبایلە دواتر لەم هەنگاوەی تردا جۆری مۆبایلەکەت دیاری دەکەیت :**




**ئەگەر مۆبایلەکەت (Nokia)ە ئەوا لێرەدا مۆدیلەکەی دیاری بکە .**




**ئەگەر مۆبایلەکەت (Sony Ericsson) ە ئەوا لێرەدا مۆدیلەکەی دیاری بکە.**




**وە ئەگەر مۆبایلەکەت (Pocket PC)ە ئەوا کلیك لێرە بکە.**



**بۆ نمونە مۆبایلەکەت (Nokia) ە ئەوا کلیك لەو بەشەی کە تایبەتە بەم جۆرە مۆبایلە دەکەیت وە دواتر بەم شێوە مۆدیلەکەی هەڵدەبژێریت:**




**وە ئێمە بۆ نمونە مۆدیلی (Nokia 6600) هەڵدەبژێرین ئەوا لەم بەشەی دواتر هرچی بەرنامە بۆ ئەم مۆبایلە دەبێت پێمان نیشان دەدات:**



پاش ئەوە هەر بەرنامەیەکمان بوێت لەو لیستەی پیشانی داین ئەوا یەك کلیکی لیٚ دەکەین ،بۆ نمونە ئێمە ئەگەر بمانەوێت بەرنامەی ئەنتی ڤایرۆسی( KasperSky ) داونلۆد بکەین ئەوا پاش کلیك کردنە سەری دەچێتە ئەم بەشەی دواتر کە لێرەشدا کلیك لە ( Download ) دەکەین بۆ دابەزاندنی ئەو بەرنامە بۆ ناو کۆمپیوتەرەکەمان و دواتر گواستنەوەیەتی لە کۆمپیوتەرەکەمانەوە بۆ مۆبایلەکەمان :




دواتر لەم هەنگاوەدا بۆ ماوەی ١٥ چرکە چاوەریٚ دەکەین و دواتر نوسراوێك دەنوسرێت لە جێی ئەو شوێنەی کە چرکەکانی لیٚ دەژمێردرێت و کلیکێکی لە سەر دەکەین و ئەو بەرنامە داونلۆد دەبێت بەلاّم ئەم بەرنامانە سنووردارن واتە ناتوانیت سوود لە هەموو بەرنامەکانی ئەم سایتە وەربگریت تاوەکو نەبیتە ئەندام :



**پاش ١٥ چرکەکە بەم شێوەی لێ دێت:**




**بــۆ داونلــۆدکردنی بەرنامەکــە کلیــك لـــەم نوســـراوە دەکەین.**




**پاشان کلیك لە ( Save ) دەکەین بۆ خەزنکردنی ئەو بەرنامە لەو شوێنەی بۆی دیاری دەکەین لە کۆمپیوتەرەکەماندا**

**بەڵام بۆ بە ئەندام بوون لەم سایتەدا بۆ ئەوەی کە بتوانین هەرچیەکمان بوێت لەم سایتەو بەبێ سنوور چیمان بوێت دایبەزێنین ئەوا کلیك لە ( Register for free ) دەکەین :**




**کلیك لەم بەشە دەکەین بۆ بوون بە ئەندام لەم سایتەدا.**

**دواتر لە بەشی خوارەوەی پەڕەی داهاتوو ئەم چوارگۆشە بچوکە دیاری دەکەین و کلیك لە ( Register ) دەکەین :**




**دواتر ناوێك دادەنێیت بۆ خۆت و پاشان وشەیەکی نهێنیش وە دوجار دەینوسیتەوە :**



ئەو ژمارەیەی کە نوسراوە تۆ لەناو بۆشاییەکەدا بینوسەرەوە:




دواتر کلیك لە ( Submit my registration ) دەکەین:

ئێستا تۆ بویتە ئەندام لەم سایتەداو دەتوانیت هەرچیەکت بوێت داونلۆدی بکەیت......



# باسێك دەربارەی ئینتەرنێت

## پێناسەی ئینتەرنێت

ئینتەرنێت سیستمێکی زانیاری جیهانییە کە پشت بە کۆمپیوتەر دەبەستێت. ئینتەرنێت پێکهاتووە لە چەندین تۆڕی پێکەوەبەستراوی کۆمپیوتەر. هەر تۆڕێك ئەکرێت دەیان، سەدان یان هەزاران کۆمپیوتەری پێکەوە بەستبێت بۆ ئەوەی توانای هاوبەشکردنی زانیاری و کارکردنیان پێ ببەخشێت. ئینتەرنێت ڕێگەی بە خەڵك داوە لە سەرانسەری جیهاندا پەیوەندی بەیەکەوە بکەن بە شێوەیەکی خێرا و هەرزان. ئینتەرنێت لە میدیا باوەکانی وەکو تەلەفیزیۆن و ڕادیۆ ناچێت لەوەدا کە یەك سیستمی ناوەندی پەخشکردنی نییە، بەڵکو کەسێك کە ئینتەرنێتی هەبێت ئەتوانێت ڕاستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ هەرکەسێکی دیکەدا بکات لەسەر ئینتەرنێت، زانیاری بڵاوبکاتەوە بۆ کۆمەڵێك کەس، زانیاری دەست خۆی بخات، یاخود پرۆگرام و خزمەتگوزاری دوور بەکاربێنێت، یان کەلوپەل بکرێت و بفرۆشێت.




کۆمپانیاکانی دابینکردنی خزمەتگوزاری ئینتەرنێت (Internet Service Providers کە کورتکراوەکەی ISP ە) ئینتەرنێت بۆ بەکارهێنەرەکانیان دابین دەکەن بەرامبەری بە کرێیەکی مانگانە. بەکارهێنەرێك کە هێڵێك لە ISP ەکەوە وەردەگرێت نێتوورك (واتە تۆڕ) ی ISP ەکە بەکاردێنێت بۆ چوونەناوەوەی ئینتەرنێت. لە زۆر وڵاتدا ISP ەکان کۆمپانیای تایبەتن، لە ئەو وڵاتانەشدا کە حکومەت کۆنترۆڵی خزمەتگوزارییەکانی تەلەفۆن دەکات ISP ەکانیش سەر بە حکومەتن.

ڕێکخراوێك کە چەند کۆمپیوتەرێکی هەبێت زۆرجار ئیش بە نێتوورکێکی تایبەت دەکات کە پێی دەوترێت ئینتراتنێت (intranet)، کە کۆمپیوتەرەکانی ناو ڕێکخراوەکە پێکەوە دەبەستێت. بۆ ئەوەی خزمەتگوزاری ئینتەرنێت دابین بکات، ڕێکخراوەکە ئینترانێتەکەی پەیوەست دەکات بە ئینتەرنێتەوە.

قەبارەی ئینتەرنێت هەموو ٩ بۆ ١٤ مانگێك زیادی کردووە بۆ دوو ئەوەندە هەر لە کۆتایی ساڵەکانی ٧٠ وە. لە ساڵی ١٩٨١ دا تەنها ٢١٣ کۆمپیوتەر پەیوەندییان بە ئینتەرنێتەوە هەبوو. لە ساڵی ٢٠٠٠ دا ئەم ژمارەیە گەشەی کردووە بۆ ٤٠٠ ملیۆن. ژمارەی ئەو کەسانەی کە ئێستا ئینتەرنێت بەکاردێنن تەنها دەکرێت بخەملێنرێت. هەندێك لێکۆڵەر وتیان کە وا پێشبینی دەکرێت لە ساڵی ٢٠٠٥ دا ژمارەی بەکارهێنەرەکان بووبێت بە ١ ملیار.

## تەماشاکردنی ئینتەرنێت یان وێب؟

زۆر بەکارهێنەری ئینتەرنێت پێی وایە کە ئینتەرنێت بریتییە لە پرۆگرامی Internet Explorer، کە بە کلیك کردن یان دەبڵ کلیك کردن لەسەر ئایکۆنەکەی خوارەوە دەتوانیت بچیتە ناویەوە لە زۆر شوێنی کۆمپیوتەرەکەتەوە:

ئەمەش بیرکردنەوەیەکی هەڵەیە. Internet Explorer یەکێکە لە پرۆگرامەکانی تەماشاکردنی وێب (نەك ئینتەرنێت، ئینتەرنێت تەماشا ناکرێت! مەبەست لە ئینتەرنێت وایەر (یان بێ وایەر) ەکانە کە تۆڕی کۆمپیوتەرەکان پێکەوە دەبەستێت).

چەند پرۆگرامێکی بەناوبانگ هەن بۆ تەماشاکردنی وێب، لە خوارەوە بەناوبانگترینیان دەنووسین:

✓ **پرۆگرامی** Windows Internet Explorer : کە لەگەڵ سیستمی کۆمپیوتەرەکەت (ویندۆز) دا دادەبەزێت. لەبەر ئەوەی سیستمی ویندۆز لە زۆربەی وولاتانی جیهاندا زۆرترین بەکارهێنەری هەیە، ئەم پرۆگرامە لە هەموو پرۆگرامەکانی دی زیاتر بەکاردێت.

✓ **پرۆگرامی** Mozilla FireFox: فایەرفۆکس پرۆگرامێکی خۆڕاییە کە لەلایەن رێکخراوی Mozilla وە بە پشتگیری چەند رکەبەرێکی کۆمپانیای مایکرۆسۆفت (خاوەی پرۆگرامی Internet Explorer) دروستکراوە. ئەم پرۆگرامە لە سەرانسەری جیهانەوە لەلایەن شارەزایانی بواری سۆفتوێر پشتگیری دەکرێت، بەگشتی بۆ رێگەگرتن لە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت لە دەستبەسەرداگرتنی وێب.

✓ **پرۆگرامی** Opera: یەکێك لە پرۆگرامە تا رادەیەك ناسراوەکان، کە کۆمپانیای Opera Software ASA دەریدەکات.

# بەشی دووەم

# پرۆگرامی Internet Explorer

وێب بریتییە لە پەنجەرەی تۆ بەسەر ڕووی جیهاندا، جا ئایا تۆ پێی ئەڵێیت ئینتەرنێت، یان نێت، یان وێب، ئایا بەکاری دێنیت بۆ ئیش و کار، یان خوێندن، یان لێکۆڵینەوە، یان پەیوەندی کردن، یان کڕین و فرۆشتن. بە پشت بەستن بەو شێوازە بیرکردنەوەیە، گەشەپێدەرانی ویندۆزی ڤیستا بەشێوەیەك دروستیان کردووە کە ڕێگەت پێ بدات هاتوچۆ بکەیت لە نێوان وێب و کۆمپیوتەرەکەتدا بە ڕێگەیەکی بێ ماندووبوون. پرۆگرامی Internet Explorer (ئینتەرنێت ئێکس پلەو رەر) بە تایبەتی بۆ جیهانی ئینتەرنێت دروست کراوە و تایبەتمەندێتی بەهێز پێشکەش دەکات کە گەڕانت بەناویدا ئاسان و بەئاسایش دەکات.

کاتێك پرۆگرامی Internet Explorer دەکەیتەوە، سەرەتا ئەت بات بۆ ماڵپەڕەکەت (یان ماڵپەڕەکانت)، کە بە گشتی بریتییە لە لاپەڕەیەك یان کۆمەڵێك لاپەڕە کە ئەو زانیارییانەت پیشان ئەدات کە ئەتەوێت هەموو ڕۆژێك بیان بینیت. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر بتەوێت ماڵپەڕەکەت یان ماڵپەڕەکانت بگۆڕیت، ئەتوانیت ئەمە لە ڕێگەی دوو کلیکەوە بکەیت. ئەتوانیت چەندین لاپەڕەی وێب پێکەوە بکەیتەوە، هەریەکەیان لە "تاب" ی خۆیدا، ئەش توانیت بە ئاسانی بەناو تابەکاندا هاتوچۆ بکەیت. ئەگەر لاپەڕەیەك یان کۆمەڵێك لاپەڕە هەن کە ئەتەوێت لە داهاتوودا سەردانیان بکەیتەوە، ئەتوانیت لە لیستی Favorites دا دایان بنێیت، جا بەرنامەی Internet Explorer عینوانی لاپەڕەکانت بۆ خەزن دەکات. ئەتوانیت لاپەڕەیەکی وێب خەزن بکەیت و بینێریت بۆ کەسانی تر، یان بەشێك لە لاپەڕەکە کۆپی بکەیت و لە دۆکیومێنتێکدا بەکاری بێنیت. ئەش توانیت بەشداری بکەیت لە فید (feed: تەکنۆلۆجیایەکی تاڕادەیەك نوێی ئینتەرنێتە، کە بەکاردێت بۆ ناردنی هەواڵ و زانیاری لە سایتەکانی ئینتەرنێتەوە بۆ بەکارهێنەران بەشێوەی دەست بە جێ، بۆ نموونە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بەکاری دێنن بۆ بڵاوکردنەوەی هەواڵەکان، تۆش ئەگەر بەشداریت کردبێت لە "فید" ی کەناڵەکەدا، ئەوا هەواڵەکەت پێ دەگات بەبێ ئەوەی پێویست بکات سەیری سایتەکە بکەیت، بەڵکو هەواڵ لە دوای هەواڵ لە شوێنێکی جیادا بۆت کۆدەکرێتەوە) یکدا بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ناوەڕۆکی نوێی سایتێك ببینیت.

## لە Internet Explorer دا چی لە کوێدایە؟

هەرچەندە ئەتوانیت بە ئارەزووی خۆت بەرنامە بەکار بێنیت بۆ کردنەوەی ئینتەرنێت، بەڵام لەوانەیە بتەوێت نوسخە تازە و پێشکەوتووەکەی بەرنامەی Internet Explorer بەکار بێنیت کە لەگەڵ ویندۆزی ڤیستادا دێت، کە بەهێز و بەسوود و سادەیە. ئەگەر حەزت لە ڕووکارە نوێکەی نییە، ئەتوانیت دیمەنەکەی بگۆڕیتەوە بۆ شێوازەکەی جارانی، بە کلیك کردن لەسەر دوگمەی Tools یان پەنجە نان بە کلیلی Alt دا.


دوگمەی زیاد کردن بۆ لیستی Favorites
دوگمەی Quick Tabs
تابەکان
دوگمەی ڕۆشتن بۆ لاپەڕەی داهاتوو
دوگمەی گەڕانەوە بۆ لاپەڕەی پێشوو
سەنتەری Favorites
BirdWeb - Family Details - Windows Internet Explorer
http://www.birdweb.org/birdweb/family_details.aspx
BirdWeb - Family Details
Moon Joyce Resource
Favorites
Feeds
History
Links
Microsoft Web Sites
BirdWeb - Home
Moon Joyce Resources
MS Press Books
Hot Off the Press
Microsoft® Office Word 2007 Plain & Si...
Microsoft® Windows Vista™ Plain & Sim...
The 2007 Microsoft® Office System Plain...
Home
Done


دوگمەی Home (ماڵپەڕ)
ئادرێس بار
New Tab
دروستکردنی تابی نوێ
فیدەکانی RSS
دوگمەی پرنت
لیستی Tools
لیستی Page
BirdWeb
Learn About The
Birds of Washington State
Birds
Ecoregions
Birding Sites
Resources

## دۆزینەوەی لاپەڕەیەکی وێب

تۆ زۆربەی هاتووچۆت لە ئینتەرنێتدا بەهۆی بکارهێنانی هایپەرلینکەوە دەبێت (هەر لینکیشی پێ دەوترێت) کە لە سەر لاپەڕەکانی ئینتەرنێتدا هەن. کاتێك کلیك لەسەر لینکێك ئەکەیت، ناونیشانێکی ئینتەرنێتی ئەنێررێت بۆ پرۆگرامی ئینتەرنێتەکەت، ئەویش بۆ سایتەکە دەگەڕێت و لاپەڕە داواکراوەکە پیشان ئەدات. دوای ئەوەی شوێنی لاپەڕەکەت دۆزیەوە، ئەتوانیت لە لاپەڕەکەش زیاتر دەربچیت و بگەڕێیت. ئەم پرۆسەیە تۆزێك لە گەڕان بۆ ووشەیەك دەچێت لە فەرهەنگێکدا، پاشان گەڕان بۆ ووشەیەکی تر بۆ تێگەشتن لە ووشەی یەکەم.

←

← بدۆزەرەوە

١. خەتی ئینتەرنێتەکەت بخەرە ئیش ئەگەر کوژاوەتەوە، پاشان Internet Explorer بکەرەوە ئەگەر نەکراوەتەوە.

٢. لە لاپەڕەکەی ئێستاتدا، یەکێك لەم شتانە بکە:

- کلیك لەسەر بۆکسی گەڕان بکە، پاشان ناوێك یان هەر ووشەیەك کە دەتەوێت بنووسە و پەنجە بە Enter دا بنێ بۆ پیشاندانی تابێکی نوێ کە ئەنجامەکانی گەڕانەکەی تێدایە.
- کلیك لەسەر لینکێك لە لاپەڕەکەدا بکە بۆ ڕۆشتن بۆ لاپەڕەیەك یان سایتێکی نوێ.
- پەنجە لەسەر کلیلی Ctrl دابنێ و ئینجا کلیك لەسەر لینکێك بکە بۆ کردنەوەی لاپەڕەکە لە تابێکی نوێدا و هێشتنەوەی لاپەڕە ئەسڵییەکە لە شوێنی خۆیدا.
- کلیك لەسەر دوگمەی Back یان Forward بکە بۆ چوون بۆ لاپەڕەیەك کە پێشتر سەردانت کردبێت.
- کلیك لەسەر تابی لاپەڕەیەکی کراوە بکە بۆ دووبارە سەیرکردنی.
- لیستی Address bar بکەرەوە بۆ دۆزینەوە و ڕۆشتن بۆ سایتێك کە پێشتر سەردانت کردبێت، یاخود لە ناو Address bar ەکەدا ناونیشانی سایتێکی نوێ بنووسە بۆ ڕۆشتن بۆ ئەو سایتە. ئەگەر ئەتەوێت لاپەڕە نوێکە لە تابێکی دیکەدا بکرێتەوە بۆ ئەوەی لاپەڕەکەی ئێستات لەدەست نەچێت، یەکەم جار کلیك لەسەر دوگمەی New Tab بکە و ئینجا ناونیشانەکە بنووسە.

## کردنەوەی زیاتر لە یەک لاپەڕە

ئەگەر تۆ تا ئێستا ویستوتە کە بەجارێك ئیش بە چەند لاپەڕەیەك بکەیت، ئەوا "تاب" ەکانی Internet Explorer ئەم ئیشە زۆر بۆ ئاسان ئەکەن. هەر ئەوەندەت لەسەر کە لاپەڕەکان لە تابەکانی خۆیاندا بکەیتەوە.

### دیاریکردنی لاپەڕەکە

١. لە پرۆگرامی Internet Explorer دا، کلیك لەسەر New Tab بکە.

٢. دەست بکە بە نووسینی ناونیشانی ئەو سایتەی کە ئەتەوێت. ئەگەر ناونیشانەکە لە لیستێکدا دەرکەوت، کلیکی لەسەر بکە. ئەگەر دەرنەکەوت، هەموو ناونیشانەکە بنووسە و پاشان پەنجە بە کلیلی Enter دا بنێ.



### بەکارهێنانی لینکێک

١. پەنجە لەسەر کلیلی Ctrl دابنێ و کلیك لەسەر لینحەکە بکە.

٢. کلیك لەسەر لەسەر تابە نوێکە بکە بۆ پیشاندانی.

## پیشاندانی زیاتر لەیەک لاپەڕە پێکەوە

تایبەتمەندێتییەکی نوێ و گرنگی Internet Explorer بریتییە لە ئەو توانایەی کە ئەیدا بە تۆ بۆ هێشتنەوەی چەند لاپەڕەیەك پێکەوە بە کراوەیی، هەر یەکەیان لە تابی خۆیدا. بەو ڕێگەیە، ئەتوانیت لاپەڕەیەك بە کراوەیی بەجێ بێڵیت و بچیت بۆ لاپەڕەیەکی تر، پاشان بە ئاسانی بگەڕێتەوە سەری.

### پیشاندانی زیاتر لە یەک لاپەڕە

١. لە Internet Explorer دا، کلیك لەسەر تابێك بکە بۆ پیشاندانی لاپەڕەکە.

٢. کلیك لەسەر دوگمەی Quick Tabs ئەگەر ئەتەوێت هەموو لاپەڕە کراوەکان پیشان بدەیت.

٣. کلیك لەسەر لاپەڕەیەك بکە بۆ چوون بۆ تابەکەی و پیشاندانی.



## پاک کردنەوەی تابەکان

١. کاتێك چەند لاپەڕەیەکت کردووەتەوە، کلیکی ڕاست لەسەر تابێك بکە، پاشان لە لیستەکەدا یەکێك لەم شتانە بکە:

- Close هەڵبژێرە بۆ داخستنی لاپەڕەکە و تابەکە.
- Close Other Tabs هەڵبژێرە بۆ داخستنی هەموو تابەکانی تر بێجگە لەو تابەی کە کلیکت لەسەر کردووە.




## گەڕانەوە بۆ سایتە خوازراوەکانت

کاتێك سەرچاوەیەکی باشی زانیاری یان کات بەسەربردنت دۆزیوەتەوە، پێویست ناکات کاتێکی زۆر بەفیڕۆ بدەیت بۆ گەڕان بەدوایدا کاتێك جارێکی تر ویستت سەردانی بکەیتەوە. ئەتوانیت بە ئاسانی سایتەکە بخەیتە لیستی سایتە خوازراوەکانت، پاشان Internet Explorer ڕاستەوخۆ لینکێکت بۆ دروست ئەکات بۆ ئەو سایتە.

## خەزن کردنی شوێنێک

١. بچۆ بۆ ئەو سایتەی کە ئەتەوێت شوێنەکەی خەزن بکەیت. ئەگەر ئەتەوێت چەند سایتێك پێکەوە خەزن بکەیت لە گروپێکی تابدا، هەر سایتە و لە تابێکدا بکەرەوە.

٢. کلیك لەسەر دوگمەی Add To Favorites بکە، پاشان دیاری بکە ئایا ئەتەوێت شوێنی تەنها لاپەڕە دەرکەوتووەکە خەزن بکەیت بۆ ئەوەی دایەلۆگ بۆکسی Add A Favorite ت بۆ بکرێتەوە یان شوێنی هەموو لاپەڕە کراوەکان خەزن بکەیت بۆ ئەوەی دایەلۆگ بۆکسی Favorites Center ت بۆ بکرێتەوە.

٣. ناوێك بۆ سایتەکە بنووسە، یاخود هەر ناوە نووسراوەکە بەکاربێنە ئەگەر نووسرابوو.

٤. ئەگەر ئەتەوێت لینکەکە بخەیتە فۆڵدەرێکەوە، فۆڵدەرەکە هەڵبژێرە.

٥. کلیك لەسەر Add بکە.







### گەڕانەوە بۆ شوێنێکی خەزن کراو

١. کلیك لەسەر دوگمەی Favorites Center بکە.

٢. کلیك لەسەر دوگمەی Favorites بکە ئەگەر خۆی کلیکی لەسەر نەکراوە.

٣. ئەگەر لینکەکە بۆ ئەوی لاپەڕەی کە ئەتەوێت بۆ بگەڕێیتەوە دیار بوو، کلیلی لەسەر بکە.

٤. ئەگەر لینکەکە لە فۆڵدەرێکدایە و دیاری نییە، کلیك لەسەر فۆڵدەرەکە بکە بۆ پیشاندانی ناوەڕۆکەکەی.

٥. ئەگەر ئەتەوێت یەکێك لە لاپەڕەکان کە لە لیستەکەدا بکەیتەوە، کلیك لەسەر لینکەکەی بکە. بۆ کردنەوەی لاپەڕەکە لە تابێکی نوێدا،

٦. ئەگەر ئەتەوێت هەموو لاپەڕەکانی ناو فۆڵدەرەکە لە تابی جیاجیادا بکەیتەوە، کلیك لەسەر دوگمەی Open In A Tab Group بکە.







## ڕۆشتن بۆ لاپەڕەیەکی دیاریکراو

ئەگەر کەسێك ناونیشانێکی ئینتەرنێتی پێدابیت کە لە یەکێك لە شێوازی ئاساییەکاندا نەبێت، بۆ نموونە لینکێك لە دۆکیومێنتێکدا، لە ئیمەیلێکدا، یان لە لاپەڕەیەکی ئینتەرنێتی دیکەدا، ئەتوانیت بە ئاسانی ناونیشانەکە دیاری بکەیت. هەروەها پێویست ناکات بچیت بۆ ماڵەپەڕەکەت، ئەتوانیت ڕاستەوخۆ بچیت بۆ ناونیشانە دیاریکراوەکە. بۆ ئەوەی ئەمە بکەیت، Address bar بەکار بێنە لە Internet Explorer دا، یان لە هەر فۆڵدەرێکی تردا لە کۆمپیوتەرەکەتدا.

### دیاریکردنی ناونیشانەکە

١. کلیك لەسەر ئەو ناونیشانە بکە کە لە Address bar دا نووسراوە (و تۆ ئیشت پێی نییە).

٢. ناونیشانەکە بنووسە، یان ئەگەر پێشتر لە شوێنێکی دیکەوە کۆپیت کردبوو، پەنجە بە Ctrl + V دا بنێ بۆ دانانی.

٣. کلیك لەسەر دوگمەی Go بکە یاخود پەنجە بە کلیلی Enter دا بنێ بۆ چوون بۆ سایتەکە. ئەگەر ئەتەوێت سایتەکە لە تابێکی نوێدا بکرێتەوە، ئەوا یەکەمجار پەنجە لەسەر Alt دابنێ و ئینجا کلیك لەسەر Go بکە یان پەنجە بە کلیلی Enter دا بنێ.







## دیارکردنی ماڵپەڕەکەت یان ماڵپەڕەکانت

کاتێك پرۆگرامی Internet Explorer ئەکەیتەوە، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ئەچیت بۆ ماڵپەڕەکەت. ئەتوانیت چەند لاپەڕەیەك دیاری بکەیت بۆ ئەوەی پێکەوە بکرێنەوە. ئەگەر حەز ئەکەیت ماڵپەڕەکەت بگۆڕیت، ئەتوانیت ماڵپەڕێکی نوێ دیاری بکەیت تەنها بە چەند کلیکێك.

### دیاریکردنی ماڵپەڕ یان ماڵپەڕەکانت

١. بەهۆی Internet Explorer ەوە بچۆ بۆ ئەو لاپەڕەیەی کە ئەتەوێت بیکەیت بە ماڵپەڕت. ئەگەر ئەتەوێت لاپەڕەی زیاتر لە گروپێکی ماڵپەڕدا دیاری بکەیت، لە تابی نوێدا لاپەڕە زیادەکان بکەرەوە.
٢. کلیك لەسەر سەهمی سەربەرەوخواری دوگمەی Home بکە، پاشان کلیك لەسەر Add Or Change Home Page بکە لە لیستەکەدا.
٣. لە دایەلۆگ بۆکسی Add Or Change Home Page دا، ئەو هەڵبژاردنانە دیاری بکە کە ئەتەوێت.
٤. کلیك لەسەر Yes بکە.







## دۆزینەوەی شتێک لە ئینتەرنێتدا

بۆ گەڕان بۆ شتێکی دیاریکراو لە ئینتەرنێتدا، بۆ نموونە لیستی کۆمەڵێک سەرچاوەی کە بتوانیت لێیانەوە کتێبی دیکەی Plain & Simple بکڕیت، یاخود ناونیشان و لیستی خواردنی ڕیستۆرانتێک کە ئەتەوێت تاقی بکەیتەوە، ئەتوانیت لە هەر شوێنێکی ویندۆزی ڤیستاوە بۆی بگەڕێیت. کاتێک ئەنجامی گەڕانەکەت پیشان ئەدرێت، ئەتوانیت باز بدەیت بۆ ئەو لاپەڕەیەی کە ئەو زانیارییەی تیایە کە بۆی ئەگەڕایت، جا ئەگەر ئەو لاپەڕە ئەو زانیارییەی تیا نەبوو، ئەتوانیت لاپەڕەیەکی تر تاقی بکەیتەوە.

### گەڕان بۆ شتێک

١. لە Internet Explorer دا، کلیك لەسەر دوگمەی Search Options بکە، پاشان خزمەتگوزارییەکی گەڕان دیاری بکە ئەگەر خزمەتگوزارییە ئەسڵییەکەت ناوێت. ئەگەر ئەو خزمەتگوزارییە لە لیستەکەدا نەبوو، کلیك لەسەر Find More Providers بکە، پاشان یەکێك لە خزمەتگوزارییەکان دیاری بکە لەو لاپەڕەیەی کە بۆت ئەکرێتەوە.

٢. کلیك لەسەر بۆکسی Search بکە، پاشان زانیاریی گەڕانەکە بنووسە، پاشان پەنجە بە Enter دا بنێ بۆ دەستپێکردنی گەڕانەکە. ئەگەر ئەتەوێت ئەنجامەکان لە تابێکی نوێدا پیشان بدرێن، پەنجە بە Alt + Enter دا بنێ لە جیاتی تەنها Enter.

٣. کلیك لەسەر لینکێك بکە لە ئەنجامەکاندا.

٤. هەر ئیشێکی ترت هەبوو ئەنجامی بدە لە لاپەڕەی گەڕانەکەدا.

٥. کاتێك ئیشەکەت تەواو بوو ویندۆی Internet Explorer دابخەرەوە.

## خەزنکردنی لاپەڕەیەکی ئینتەرنێت

ئەگەر لاپەڕەیەک زانیاریی گرنگی تیایە کە ئەزانیت لە داهاتوودا پێویستت پێی ئەبێتەوە، ئەتوانیت لاپەڕەکە لە کۆمپیوتەرەکەتدا خەزن بکەیت. بەم ڕێگەیە، ئەگەر لاپەڕەکان لە ئینتەرنێتدا گۆڕانکارییان بەسەردا بێت، تۆ هەر لاپەڕە ئەسڵییەکانت لەلا ئەمێنێتەوە. بەڵام شێوازی خەزن کردنی لاپەڕەکە گۆڕانکاری لەسەر شێوازی لاپەڕەکە دەبێت. دوای ئەوەی لاپەڕەیەک خەزن دەکەیت، ئەگەر بتەوێت ئەتوانیت بینێریت بۆ هاوڕێکانت یان هاوکارانت.

### خەزنکردن لاپەڕەیەکی ئینتەرنێت

١. Internet Explorer بکەرەوە ئەگەر نەکراوەتەوە. بچۆ بۆ ئەو لاپەڕەیەی کە ئەتەوێت خەزنی بکەیت.
٢. کلیک لەسەر دوگمەی Page بکە، پاشان Save As هەڵبژێرە لە لیستەکەدا بۆ پیشاندانی دایەلۆگ بۆکسی Save Webpage.
٣. ئەگەر ناتەوێت لاپەڕەکە لە فۆڵدەرە دیاری کراوەکەدا خەزن بکەیت، فۆڵدەرێکی دیکە دیاری بکە.
٤. ناوێک بۆ فایلەکە بنووسە، یان هەر ناوە نووسراوەکە بەکار بێنە.
٥. کلیک لەسەر Save As Type بکە. لە لیستەکەدا دیاری بکە چۆن ئەتەوێت لاپەڕەکە خەزن بکەیت.

- Webpage Complete بۆ خەزن کردنی لاپەڕەکە و هەموو پێکهاتەکانی، وەکو وێنەکانی ناوی (کە لە فۆڵدەرێکی جیادا خەزن دەکرێن).
- Web Archive, Single File بۆ دروستکردنی یەک فایلی ئینتەرنێتی کە هەموو پێکهاتەکانی تێدایە (واتە وێنەکان یان هەر پێکهاتەیەکی تر لە فۆڵدەری جیادا خەزن ناکرێن، هەموویان لەگەڵ نووسینەکەدا لە یەک فایلدا دەبن).
- Webpage, HTML Only بۆ خەزن کردنی نووسینی لاپەڕەکە و دیمەنی نووسینەکە و شێوازی ڕێکخستنەکەی، بەڵام پێکهاتەکانی وەکو وێنە خەزن ناکرێن.
- Text File بۆ خەزن کردنی نووسینی ناو لاپەڕەکە بە شێوەی نووسینی سادە، بەبێ هیچ جۆرە جوانکارییەک.

٦. کلیک لەسەر Save بکە.

## کۆنترۆڵکردنی پۆپەپ ویندۆکان

ئاخ! ئایا ئەمە زۆر بێزارت ناکات کاتێك ئەچیت بۆ سایتێك و لەپڕ دەرزەنێك ویندۆی لەگەڵدا ئەکرێتەوە کە ئەیانەوێت بەزۆر شتێکت پی بفرۆشن؟ بەهۆی ویندۆزی ڤیستاوە، ئەتوانیت بە Internet Explorer بڵێیت کە ئەم پۆپەپ ویندۆیانە بکوتێت. بەڵام، ئەگەر هەندێك جۆر پۆپەپ هەن کە ئەتەوێت بیان بینیت، ئەتوانیت ب Internet Explorer بڵێیت کە پیشانیان بدات.

### دیاریکردنی شێوازی نیشکردنی پۆپەپ بلۆکەر (ڕێگەگری پۆپەپ)

١. لە Internet Explorer دا، کلیك لەسەر دوگمەی Tools بکە، پاشان ماوسەکە لەسەر Pop-Up Blocker بووەستێنە و لە لیستەکەدا کلیك لەسەر Pop-Up Blocker Settings بکە بۆ پیشاندانی دایەلۆگ بۆکسی Pop-Up Blocker Settings. ئەگەر بە کاڵی نووسرابوو و نەت توانی کلیکی لەسەر بکەیت پێویستە سەرەتا لە لیستەکەدا Turn On Pop-Up Blocker هەڵبژێریت.

٢. ئەگەر ئەتەوێت پۆپەپ لە چەند سایتێکی دیاریکراوەوە ڕێگە پێ بدەیت، ناوی سایتەکان بنووسە یان دابنێ، پاشان کلیك لەسەر Add بکە.

٣. ئەم بیرخەرەوانە دیاری بکە ئەگەر ئەتەوێت.

٤. ئاستی فلتەر کردنەکە دیاری بکە:

- High بۆ بلۆك کردنی هەموو پۆپەپەکان.
- Medium بۆ بلۆك کردنی پۆپەپەکان بێجە لە ئەو پۆپەپانەی کە بە کلیك لەسەر کردن ئەکرێنەوە یاخود سایتەکە لەو سایتانەیە کە لەبەشی سایتە باوەڕپێکراوەکاندا دات ناوە.
- Low بۆ ڕێگەدان بە کرانەوەی زۆربەی پۆپەپەکان.



## کۆنترۆڵکردنی پۆپەپ ویندۆکان

١. لە سایتێکدا کە پۆپەپێك بلۆك کراوە، کلیك لەسەر Information bar بکە.

٢. ئەو کردارە هەڵبژێرە کە ئەتەوێت بیکەیت:

- Temporarily Allow Pop-Ups بۆ ڕێگە دان بە پۆپەکان لەم سایتەدا بەس بۆ ئەم جارە کە سەردانی ئەکەیت.
- Always Allow Pop-Ups From This Site بۆ ڕێگەدان بە پۆپەکانی ئەم سایتە بە شێوەیەکی هەمیشەیی.
- More Information بۆ دۆزینەوەی زانیاری زیاتر دەربارەی ئیشکردنی Information bar.




## خوێندنەوەی فیدی RSS

فیدی RSS زانیاریت پێشکەش دەکەن، زۆرجار هەواڵ لە سایتەکانەوە یان لە بلۆگەکانەوە (بلۆگ :Web log : blog: بریتییە لە سایتێك کە کەسێك یان ڕێکخراوێك بەشێوەیەی بەردەوام هەواڵ و زانیاری تیا بلاّو دەکەونەوە، هەواڵەکانیش بەپێی ڕۆژی بلاّوکردنەوەیان (یان بەپێی هەر شتێکی تر) یەك لەدوای یەك ڕیزدەبن لەناو سایتەکەدا)، کە ئەتوانیت یان ڕاستەوخۆ زانیاری لێ وەردەگریت یان بەشداری تێدا دەکەیت. کاتێك بەشداری لە فیدێکدا ئەکەیت، زانیاری نوێ بەشێوەیەکی بەردەوام بۆ کۆمپیوتەرەکەت دەنێررێت.

## دەستخستنی فیدەکە

١. لە Internet Explorer دا، بچۆ بۆ ئەو سایتەی کە ئەو فیدە RSS ەی هەیە کە ئەتەوێت (بۆ نموونە سایتی جەزیرە).

٢. کلیك لەسەر دوگمەی RSS بکە. ئەم دوگمەیە کاتێك ئیشەکات کە سایتەکە فیدی RSS ی هەبێت.

٣. لە ئەو لاپەڕەیەدا کە دەر ئەکەوێت، چاو بخشێنە بە زانیارییەکانی ناویدا و بڕیار بدە ئەگەر ئەتەوێت بەشداری لە فیدەکەدا بکەیت، ئەگەر ویستت، کلیك بەشداری تێدا بکەیت، کلیك لێرە بکە.

٤. لە دایەلۆگ بۆکسی Internet Explorer دا بەپێی ویستی خۆت گۆڕانکاری لە ناو و شوێنی فیدەکەدا بکە.

٥. کلیك لەسەر Subscribe بکە.




### خوێندنەوەی فیدەکەت

١. کلیك لەسەر دوگمەی Favorites Center بکە بۆ کردنەوەی Favorites Center.

٢. کلیك لەسەر دوگمەی Feeds بکە ئەگەر خۆی کلیکی لەسەر نەکراوە.

٣. کلیك لەسەر ئەو فیدە بکە کە ئەتەوێت پیشانی بدەیت.

٤. بۆکسی Search In Feed بەکار بێنە لەگەڵ ئامرازەکانی تردا بۆ دۆزینەوەی ئەو بابەتەی کە ئەتەوێت لە فیدەکەدا.

٥. زانیارییەکە بخوێنەرەوە.



کلیك لێرە بکە بۆ گۆڕینی هەڵبژاردنە ئەسڵییەکان، وەکو ژمارەی ئەو جارانەی کە فیدەکە تازە دەکرێتەوە لە ماوەیەکی دیاری کراودا.

## ناردنی گۆڕانکارییەکانت

ئەگەر لە یەك کۆمپیوتەر زیاتر بەکاردێنیت یان دوو بەرنامەی جیا بەکار دێنیت بۆ بەکارهێنانی ئینتەرنێت، پێویستت بەوە نییە کە لیستی سایتە خوازراوەکانت سەرلەنوێ دروست بکەیتەوە. لەجیاتی ئەوە، ئەتوانیت لیستەکە لە کۆمپیوتەرێکەوە بنێریت بۆ کۆمپیوتەرێکی تر.

### ← زانیارییەکە خەزن بکە

١. لە Internet Explorer دا، لە لیستی File دا کلیك لەسەر Import And Export بکە بۆ کردنەوەی Import/Export Wizard. ئەگەر لیستەکانت پیشان نەدرابوون، پەنجە بە Alt دا بنێ بۆ پیشاندانیان.

٢. بەناو ویندۆکەدا بچۆ، تیایدا ئەم شتانە دیاری بکە:

- ئایا ئەتەوێت سایتەکانی ناو Favorites خەزن بکەیت یان نا.
- ئەو فۆڵدەرەی ئەتەوێت خەزنی بکەیت.
- ئەو شوێنەی ئەتەوێت فایلی زانیارییەکەی تیا خەزن بکەیت.

٣. ئەگەر ئەتەوێت cookies (بریتین لە هەندێ فایلی بچووکی زانیاری کە سایتەکان لەسەر کۆمپیوتەرەکەت بەجێی دێڵن، زانیاری پاسوۆردی ئەو سایتانەی تیایە کە بەشداریت تیایاندا، زانیاری دیکەش) خەزن بکەیت، دووبارە ویندۆکە بەکار بێنە، هەمان شت بۆ فیدەکانی RSS یش.

٤. فایلەکان بنێرە بۆ سەر ئەو کۆمپیوتەرەی کە ئەتەوێت، بە بەکارهێنانی هەر ڕێگەیەك کە بە گونجاوی ئەزانیت، بۆ نموونە لەسەر سیدییەك یان لە ڕێگەی میمۆرییەکی USB ەوە.




**زانیارییەکە بگوازەرەوە**

١. لە Internet Explorer دا، لەو کۆمپیوتەرەی کە ئەتەوێت زانیارییەکەی تیا دابنێیت، لە لیستی File دا Import And Export هەڵبژێرە بۆ کردنەوەی Import/Export Wizard. ئەگەر لیستەکان پیشان نەدراون پەنجە بە کلیلی Alt دا بنێ.

٢. بەناو ویندۆکەدا برۆ، تیایدا ئەم شتانە دیاری بکە:

- ئایا ئەتەوێت زانیاریی سایتە خوازراوەکان بگوازیتەوە بۆ ئەم کۆمپیوتەرە یان نا.
- شوێنی ئەو فایلەی کە لە کۆمپیوتەرەکەی ترەوە هێناوتە.
- شوێنی خەزن کردنی فایلەکە.

٣. هەنگاوەکان دووبارە بکەرەوە بۆ گواستنەوەی cookies لەگەڵ فیدەکانی RSS .







## کۆپی کردنی بابەت لە لاپەڕەیەکی ئینتەرنێتەوە

هەندێ جار، لەگەڵ ئەوەی تۆ ئەتەوێت چەند بابەتێك لە لاپەڕەیەکی ئینتەرنێتەوە وەربگریت، هیچ ئیشت بە لاپەڕەکە هەمووی نییە. خەزن کردنی چەند بەشێك لە لاپەڕەکە کارێکی ئاسانە.

### خەزن کردنی وێنەیەك

١. کلیکی ڕاست لەسەر وێنەکە بکە، پاشان لە لیستەکەدا Save Picture As هەڵبژێرە.

٢. لە دایەلۆگ بۆکسی Save Picture دا ئەو فۆڵدەرە دیاری بکە کە ئەتەوێت وێنەکەی تیا خەزن بکەیت، لەگەڵ جۆری وێنەکە (بە شێوەیەکی گشتی جۆرەکانی JPEG و PNG و GIF شوێنی کەم لەسەر

هارد دیسکەکە داگیر ئەکەن، بەلاّم BMP شوێنی زۆر)، ئەش توانیت ناوێکی جیا بۆ وێنەکە دابنێیت ئەگەر ناوە نوسراوەکەت بەدلّ نەبوو.




### ← خەزن کردنی نووسین (دەق)

١. پەنجە لەسەر کلیك دابنێ لە سەر سەرەتای نووسینەکەدا. ئەو ئیشارەتە دەرناکەوێت کە لە بەرنامەکانی تردا دەر ئەکەوێت کە پێت ئەڵێت کلیکت لە کوێ کردووە (ئەو ئیشارەتەی کە ئەکوژێتەوە و دائەگیرسێت)، بەلاّم Internet Explorer زیرەکە، ئەزانێت لە کوێ کلیکت کردووە.

٢. ماوسەکە بەسەر نووسینەکەدا ڕابکێشە تا ئەو شوێنەی کە ئەتەوێت.

٣. ئێستا نووسینەکە کۆپی بکە، بەهۆی پەنجە نان بە کلیلی Ctrl + C.

٤. بچۆ بۆ بەرنامەیەکی دەستکاری کردنی نووسین، وەکو WordPad، ئینجا نووسینەکە دابنێ (Ctrl + V بکە)، پاشان دۆکیومێنتەکەت خەزن بکە.



# بەکارهێنانی internet explorer 7

## تازەترین سیستەمە

Internet Explorer 7

## ٢٠٠٩

چاپی تازەی internet explorer بەشی ٧ مە ، ئەم چاپە تازەیە چەندین تایبە تمەندی نوێی تێدایە بەشێوەیەکی ئاسانترو باشتر کارەکانمان بەڕێوە دەبات .

بۆ دەستکەوتنی ئەم چاپە تازەیە ئەگەر چاپی ویندۆزەکە vista بێت ئەوا پێویست بە دابەزاندن ناکات چونکە windows vista لە بنەڕەتدا چاپی internet explorer 7 ە ، وە ئەگەر ویندۆزەکە xp بوو ئەوا لەسایتی Google دا تەنها بنوسە download internet explorer7




پاش کلیك کردن لەسەر Google search چەندین سەرچاوە پیشان دەدرێت بۆ دابەزاندنی internet explorer7 :

کلیك لەسەر ئەو سەرچاوە بکە ئاماژەی پێکراوە بۆ سایتی filehippo.com ،



هەموو چاپەکانی internet explorer لـــەم ســـایتەدا ئامادەیە بۆ دابەزاندن، کلیك لەســـەر download latest version بکـە بـۆ دابەزاندنی تـازەترین چاپ ،




پاش دابەزاندنی کلیکی لەسەر بکە بۆ چوونەناو ،







ئەمە وێنەی ناو پرۆگرامی internet explorer٧ ە ، ئێستا دێینە سەر چۆنیەتی کارپێکردنی ٬



لەبۆشایی سەرەوەدا ناونیشانی ئەو سایتەی دەتەوێت دەینوسیت ، ئەگەر بمانەوێت زیاد لە یەك پەڕە بکەینەوە لە شاشەیەکدا ئەوا کلیك لەسەر new tab دەکەین ،یان لەڕێگەی کیبۆردەوە ctrl+t



بەکارهێنانی new tab ڕێگەیەکی نوێ ی بەکەڵکە بۆ کۆکردنەوەی چەندین پەڕە لەسەر شاشەیەك، هەروەها کۆنترۆڵکردنیان و تەماشاکردنیان بەڕێگەیەکی ئاسان





وەك دەبينين چەند پەڕەيەكمان لەسەر يەك شاشە جێ كردووەتەوە لەڕێگەی tab ەكان . .



بۆ داخستنی tab ێك كليك لەسەر ئەو tab ە بكە كە دەتەوێت دايبەيت دواتر كليك لەسەر هێمای × بكە بۆ داخستنی . يان لەڕێگەی كيبۆردەوە Ctrl+w وە بۆ داخستنی هەموو پەنجەرەكان بە جارێك ئەوا كليك لەسەر هێمای داخستنی دەكەين لە سەرەوە پاشان تێبينی يەك دێت كە پێت دەڵێت هەموو پەنجەرەكانی تر دادەخرێت ،

بۆ كردنەوەی بەشێك لەناو سايتێك دا سێ ڕێگەمان هەيە . كاتێك لەناو سايتێكدا هێمای ماوسەكە دەگۆڕێت بۆ هێمای دەستێك مانای وايە ئەو بەشە توانای كردنەوەی هەيە ، ئەگەر كليكی ڕاست لەسەر ئەو بەشە بكەين كە دەمانەوێت ليستێك دەكرێتەوە ،

Open

Open in New Tab

Open in New Window

بەشی يەكەم open بۆ كردنەوەی ئەو بەشەی دياريت كردووە لەسەر هەمان ئەو پەڕەی كە كراوەتەوە ' open in new tab كردنەوەی ئەو بەشەی دياريت كردووە لە پەڕەيەكی تردا بەلام لەناو هەمان شاشە ، open in new window بۆ كردنەوەی ئەو بەشە بەشێوەيەكی سەربەخۆ لە شاشەيەكی تر .



## گەڕان و دۆزينەوەی ئەو بابەتانەی كە دەمانەوێت لە ئينتەرنێت :

# زانینی پێشبینی کردنی کەش و هەوا:

ئەگەر دەتوێت لە باوەڕ پێکراوترین سەرچاوەوە کەشو هەوای داهاتوی شارەکەت بزانیت لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە ئەوا دەتوانیت لە چەند سەرچاوەیەکەوە بیزانیت بۆ نمونە یەکێك لەوانە (www.weather.msn.com) ە کە دەتوانیت کەش و هەوای ١٠ ڕۆژی داهاتوی شارەکەت بزانیت کە زۆربەی زۆری شارە کوردیەکانیشی لە خۆ گرتوە پە پێچەوانەی چەند سەرچاوەیەکی تر وەکو (yahoo) یان سایتەکانی تری جیهانی:




بۆ نمونە تۆ دەتوانیت ناوی وڵاتی خۆت بنوسیت لەم بۆشاییەدا کە پێویستە ناوی وڵاتەکەت بە ئینگلیزی بینویت بۆ نمونە بەم شێوەیە (iraq) ..

پاش ئەوەی کە ناوی وڵاتەکەت نوسی ئەوا کلیك لە  دەکەین بۆ دۆزینەوەی :



پاش ئەوەی کە کلیکمان لە (Go) کرد ئەوا ئەم بەشەی خوارەوەمان بۆ دەکرێتەوە کە تێیدا بە شێوەی نەخشە وڵاتی عێراقمان پێ نیشان دەدات و کەش و هەوای چەند بەشێکی شارە گرنگەکانمان پێ نیشان دەدات بەڵام ئەگەر ئێمە بمانەوێت بۆ نمونە پێشبینی کەش و هوای شاری سلێمانی بزانین ئەوا پێویستە کە بچینە بەشی خوارەوەی سایتەکەو کلیك لە شاری سلێمانی بکەین:






پاش ئەوەی کە کلیکمان لە ...āniyah, IRQ کرد ئەوا بە چەند شێوەیەك پێشبینیمان بۆ دەکات:





وە ئەگەر بمانەوێت لە ڕێگەر نەخشەوە کەش و هەوای ناوچەکە بزانین ئەوا لە بەشی سەرەوەی پەڕەکەدا کلیك لە (Maps) دەکەین:






ئێستا دەتوانین وێنەی ناوچەکە ببینین کە لە ڕیگەی مانگە دەستکردەکانەوە گیراوە ئەویش بە کلیک کردن لە سەر Satellite






# ڕزگاربوون لە گشت جۆرە ڤایرۆسێك لە ڕێگەی سکانی ئۆن لاین

# Online Scan

ئۆن لاین سکان یەکێکە لە شێوەکانی گەڕان و پشکنینی کۆمپیوتەرەکەت بۆ لە ناوبردنی ڤایرۆس هەروەکو بەرنامەی ئەنتی ڤایرۆسێك کە لە ناو کۆمپیوتەرەکەتدا هەتە بەڵام جیاوازی ئەم پشکنینە( Scan ) ە ئەوەیە کە :




١.زۆر بەهێزترە لە هەر ئەنتی ڤایرۆسێك کە داتبەزاندوە ئەویش بەهۆی نوێبییەوە ،واتە هەر لە کۆمپانیای ئەم ئەنتی ڤایرۆسەوە بەردەوام لە نوێکردنەوەی ئەم ئەنتی ڤایرۆسەیە بۆ پێناساندنی نوێترینی ڤایرۆسە مەترسیدارەکان.

٢. پێویست بە دابەزاندن( Download ) یان ( Set Up ) ناکات بەڵکو هەر لە ڕێگەی سایتەکەوە دەبێت ( On Line ).

٣. دەتوانیت هەر یەك هەفتە جارێك ئەم سکانە دووبارە بکەیتەوە بۆ لەناوبردنی هەرجۆرە ڤایرۆسێك لەناو کۆمپیوتەرەکەتدا.

بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارەش سەرەتا دەچینە ئەم سایتەوە( www.bitdefender.com ) :

پاشان دەچینە بەشی خوارەوەی پەڕەکەو کلیك لە ( Scan Now ) دەکەین :






**پاشان کەمێك چاوەڕوان دەبین :**



**دواتر کلیك لەم بەشە دەکەین:**




**ئێستا ئەو شوێنەی کە دەتەوێت سکانی بکەیت دیاری دەکەیت و پاشان OK دەکەین:**




**دواتر کلیك لە**

ئەم بەشە دەکەین:




**پاشان خۆی بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەست دەکات بە سکان و لەناو بردنی ڤایرۆسەکان کە پێویستە لە سەرمان تا کۆتایی کارەکە چاوەڕێ بکەین و داینەخەینەوە**



# چۆنیەتی پەیداکردن و دۆزینەوەی هەر بەرنامەو یاریەک بۆ مۆبایلەکەت لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە

سەرەتا تۆ دەتوانیت هەر بەرنامەو یاری و هەر شتێکی ترت بوێت بۆ مۆبایلەکەت دەستت بکەوێت زۆر بە ئاسانی و بە خۆڕایی ئەویش لە ڕێگەی ئەو سایتە جیهانیانەی کە هەیە و تایبەتە بە گەڕان بۆ نمونە یەکێك لەوانە سایتی Google ە کە هەر شتێکت بوێت دەتوانیت بیدۆزیتەوە لە ڕێگەی ئەم سایتەوە ، هەرچەندە ئەم سایتە زۆری لەسەر باسکراوەوە کەم کەس هەیە کە نەیبیستبێ بەلاّم کەم کەسانێکی کەم هەن کە دەتوانن هەموو پێداویستیەکانیان لە ڕێگای ئەم سایتەوە پەیدا بکەن و بتوانن زۆر بە باشی ئەم سایتە بەکاربهێنن، وە ڕۆژانە زۆر کەس پارەیەکی زۆر خەرج دەکەن بۆ دابەزاندنی بەرنامە یان یاری بۆ ناو مۆبایلەکانیان کە دەتوانن خۆیان پشت ببەستن بە خۆیان و لە ئینتەرنێتدا زۆر لەو شتانەی لە بازاڕدا هەیە گرنگتریان دەست بکەوێت ...



ئێستا باسی چۆنیەتی دۆزینەوەی هەر بەرنامەو یاریەکی مۆبایلەکەت دەکەین لە ڕێگای Google ەوە:

سەرەتا سایتی Google دەکەینەوە "www.Google.com

پاش ئەوەی کە سایتەکەمان بۆ کرایەوە ئێمە لە بەشی Web دا ئەو شتەی کە دەمانوێت دەینوسین ئەویش بەم شێوەیە :
بۆ نمونە تۆ بەدوای بەرنامەی مۆبایلی Nokia ی جۆری N73 دەگەڕێیت ...ئەوا بەم شێوەیە دەگەڕێیت:/
لە ناو بۆشایی گەڕاندا ئەمە دەنوسیت:
(Free Download N73 Programs) و دواتر کلیك لە Google Search دەکەین:



**پاشان هەوڵ دەدەین کە کام سایت لەو سایتانەی کە بۆی دۆزیوینەتەوە زیاتر مانای ئەو ڕستەی تیایە کە ئێمە نوسیومانە یان بۆی دەگەڕێین:**




**وەکو دەبینین ئەم سایتە هەموو ئەو شتانەی تێدایە کە بۆی گەڕاین و هەمووشیان بە خۆڕایی**




## تێبینی:

**بەڵام دەبێت وریای ئەوەش بین کە زۆربەی سایتەکان پێویستیان بە ئەندامبوون هەیە لە سەرەتادا یان خۆی پێش داونلۆدکردنی بەرنامەیەك پێت دەڵێت کە ئەیش زۆر ئاسانە لە هەموو کاتێکدا داوای ئیمەیلەکەت لێ دەکات کە بینوسیت و پاشان پاسسۆردەکەشت وە ئەگەر ئەم وشەیەشت دی** Confirm Email **ئەوا داوای دووجار نووسین یان دوبارە نووسینەوەی ئیمەیلەکەت یان پاسسۆردەکەت لێ دەکات بۆ بەئەندامبوون..**

**هەروەها هەر بەهەمان شێوەی سەرەوە دەتوانیت لە جیاتی** N73 **هەر جۆرە موبایلێکی تر بنوسیت بە مەرجێ** Free **لەگەڵدا بێت بۆ ئەوەی کە ئەو بەرنامە یان یاریە بە خۆڕایی بێت**

**وە هەروەها دەتوانیت لە جیاتی** Programs **شتی تر بنوسیت بۆ نمونە تۆ بە دوای قاموسێکی باشی** N73 **دا دەگەڕێیت ئەوا پێویستە بنوسیت** Free Dictionary For N73

# چۆنیەتی ناردن و وەرگرتنی وێنەو فایل و میوزیك و هتد.. لە ڕێگەی Email ەوە

**سەرەتا ئیمەیلەکەت بکەرەوە :**




**پاشان کلیك لە ( Compose ) دەکەین :**






پاشان ئێمە دەتوانین چەند فایلێك یان چەند وێنەیەك بنێرین ئێستا لە سەرەتاوە لە یەکەم خانەدا کلیك لە Brows دەکەین:

